# نازم حیکمەت

## دوا هۆنراوەکانی



**و. لە فارسییەوە هەژێن**

چاپی یەکەم، ئۆگوستی ٢٠١٤

# نازم حیکمەت

## دوا هۆنراوەکانی



**و. لە فارسییەوە هەژێن**

چاپی یەکەم، ئۆگوستی ٢٠١٤

خوێنەری هێژا

ئەم بەشە لە ژیاننامە و هۆنراوەکانی نازم حیکمەت، بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٨٩ بە زمانی فارسی کەوتە بەرچاوم و سەرنجی ڕاکێشام و دەستبەجێ کەوتمە خوێندنەوە و وەرگێڕانی بۆ کوردی-سۆرانی، بەڵام بەداخەوە لەو کاتەدا نەمتوانی وەرگێڕانەکە تەواوبکەم، هۆکاری ئەوەش نائومێدی بوو لە توانای چاپکردنی وەك ئاوارەیەکی بێکار و هەروا بوارتەنگی چاپکردنی پەرتووك و بڵاوکراوەی کوردی لە ئێرانی ئەو کاتدا، لەبەرئەوە ناچار لە نێوەندی ڕێگەدا ڕاوەستاوم.

هەشت ساڵ دواتر کاتێك کە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٩٧ لەتەك چەند هاوەڵێکدا بیرمان لە دەرهێنان و بڵاکردنەوەی (گۆڤاری هونەریی ژیلەمۆ) کردەوە، هیوای بڵاوبوونەوەی وەرگێرانەکانم ژیایەوە و کەوتمە بڵاوکردنەوەی بەشێك لە پەرتووکەکە، بەڵام دیسان جارێکی دیکە لەتەك وەستانی بڵاوبوونەوەی گۆڤارەکە، بڵاوبوونەوەی وەرگێرانی بەشەکانی دیکەی پەرتووکەکەش ڕاگیردران و تەنیا توانیم ناوبەناو هەندێکیانم لە سایتە کوردییەکان و وێبلاگەکەی خۆمدا www.hezhean.kurdplanet.com www.hezhean.kurdbloger.com. بڵاوبکەمەوە، بەداخەوە وێبلاگەکانیشم تێداچوون و لەوێشدا جارێکی دیکە لە بەردەوامی بڵاوکردنەی وەستام و چاوەڕێ مامەوە، وا جارێکی دیکە پاش ساڵانێکی زۆر لە ئێستادا ئەم هەلەم بۆ ڕەخساوەتەوە، کە هەموو بابەتەکانی پەرتووکەکە [نازم حیکمەت، دوایین هۆنراوەکانی] پێشکەش بە خوێنەرانی کوردیزان بکەم و لەم ڕێگەیەوە نازم حیکمەت و بەشێك لە ڕووداوەکانی هاودەمی ژیانی ئەو بە خوێنەران ئاشنابکەم.

هیوادارم خوێنەرانی پەیگیر لە دەستنیشانکردن و ڕەخنەگرتن لە هەڵەی وەرگێڕان و داڕشتن و تایپکردن، کە لە هەموو کارێکدا ئەگەریان هەیە، نەبوورێن و کەمێك لە کاتی بەنرخ خۆیان بۆ بەرگرتن بە ویرانیی زمان و ناتەواویی وەرگێڕانەکان تەرخانبکەن، تاوەکو هەم وەرگێرەران و نووسەران دەرکی کەموکوڕی کارەکانی خۆیان بکەن و هەم سەرنجی خوێنەرانی دیکەش بۆ هەستیاریی بەرانبەر هەڵە و نادروستییەکان ڕابکێشێن.

هەژێن

# نازم حیکمەت باشتر بناسین

*"ڕەگی هۆنراوەکانی من لە خاکی سەرزەمینی مندایە"*
*نازم حیکمەت*

## لە سێ ساڵیدا لە حەڵەبی تازە، پاشا بووم

ساڵی لە دایکبوونی نازم حیکمەت ١٩٠٢ی زاینییە. لەم ساڵەدا یەکەمین کۆنگرەی شۆڕشگێڕان و ئازادیخوازانی سەرتاسەری ئیمپراتۆری گەورەی ئوسمانی لە پاریس دەبەسترێ و ئەم کۆنگرەیە سەرەتایەکە بۆ هەڵگێڕانەوەی کۆشکی سەرکوتگەرانەی سوڵتان عەبدولحەمید'ی دووەم ئیمپراتۆری سەرکوتگەری ئوسمانی.

حیکمەت بەگ باوکی نازم، ئەندامی شالیارگەی کاروباری دەرەوەی ئوسمانییە و لە سالۆنیك خزمەتدەکات و باپیرە گەورەی نازم پاشا لە پیاوانی دەوڵەتی ئوسمانییە، کەسێکی ئازادە و شەیدای هۆنراوە و ئەدەب و هۆگری هۆنراوەکانی مەولەوی'یە و پێشتر والی زۆرێك لە ویلایەتەکانی تورکیە بوو، بەڵام لەبەرئەوەی کە لە ماوەی فەرمانڕەواییدا لە مێرسین دژی خۆبەدەستەوەدان [کاپیتۆلاسیۆن] وەستاوەتەوە و ئینگلیزێکی مرۆڤکوژی بەبێ ڕەزامەندی کۆشکی پاشایەتی لەسێدارەدا، بەو هۆیەوە لەبەرچاوی سوڵتان کەوتوو و ئەوییان بەشێوەی نیوە دوورخرانەوەیەك وەك والی بۆ حەڵەب نارد.

حیکمەت بەگ'یش لەو کاتانەدا لە خزمەتی شالیارگەی دەرەوە وەرسدەبێت، بە هاوسەرەکەی جەلیلە خاتوون، کچی ئەنوەر پاشا کە ژنێکی جوان، تێگەیشتوو و خوێنەدوار بوو و زمانی فەرەنسی بە چاکی دەزانێ و نیگارکێشیشدەکات دەڵێت "من لە شالیارگەی دەرەوە وازدەهێنم, چونکە لەم بارەدا یان دەبێت لایەنگری سوڵتان بیت و سیخوڕیی بکەی یان ئازادیخواز بی و بەرەوپیری مەرگ بڕۆی". بە ڕەزامەندی جەلیلە خاتوون واز لە کارەکەی دەهێنێ و لەبەرئەوەی کە لەو جێیە دەرامەتێکی نییە، ناچار کوڕە تازە لەدایکبووەکەیان [نازم] لەتەك خۆیاندا دەبەن و دەچنە حەڵەب بۆ لای نازم پاشا. نازم حیکمەت تا سێ ساڵی

لە حەڵەب لەلای باپیرەی دەژی و لێرەدا مەبەست لەو ساڵانەیە، کە لە هۆنراوەی ئۆتۆبیۆگرافی خۆیدا دەڵێت " لە حەڵەبی تازە پاشا بووم".

سەرئەنجام پاشا'ش خانەنشینکراو لەتەك خێزانەکەیدا گەڕایەوە ئیستانبول. موچەی خانەنشینی پاشا بەشی ژیانی خێزانەکەی نەدەکرد. نازم کە یەکەم جار ناردبوویانە فێرگەی مناڵە دەوڵەندەکان، ناچار گواستیانەوە بۆ فێرگەیەکی هەرزانتر، باپیرەی خانەنشین، هەرچەندە لەکاتی دەستکورتیشدا ماڵەکەی هەمیشە پڕ بوو لە میوان، بەڵام بێجگە لە باسی هۆنراوە و هۆنەری، هیچ کارێکی دیکەی نەبوو و نازم'ی بچکۆڵەش لە تەنیشتی ئەو و لەژێر کارایی کەشی ئەم کۆڕ و کۆمەڵانەدا لەتەك شەیدابوونی بۆ هۆنراوە و هۆگریی بۆ مەولەوی گەورە بوو.

لەو ڕۆژانەدا جەنگی جیهانی یەکەمیش دەستپێکردبوو و دەوڵەتی ئوسمانی شانبەشانی ئاڵمانیا چووبووە جەنگەکەوە و ئەم کارە هەژاریی خێزانەکەی زیاتر دەکرد. لە هەمانکاتدا پاشا کە لە گەڕەکەکەدا بە کەسێکی پایەبەرز دادەنرا، هەمیشە خۆی ناچار بە یارمەتی هەژاران دەدی، کە ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبووندابوون و دەهاتنە بەر دەرکەکەی و ئەو دەرامەتە کەمەشی کە هەیبوو، لەنێو هەژاراندا دابەشدەکرد.

نازم پەڕاوەکانی فێرگەی، یەك بە یەك لەو هۆنراوانەی کە دەیهۆنینەوە، پڕدەکردەوە. لە کۆتایی جەنگدا ئەو هۆنراوانەی کە نازم دەیانهۆنێتەوە، لە کۆڕ و کۆمەڵەکانی باپیرەیدا دەخوێندرانەوە و هەموویان ئافەرینیان لێدەکرد. جەمال پاشا شالیاری دەریاوانیی کە ئەندامی ئەم کۆڕ و کۆمەڵانەیە، شەیدای خۆشیی و چالاکی نەوەی پاشا دەبێت و هانیدەدا، تاوەکو بچێتە فێرگەی هێزی دەریایی. نازم بەو پێشنیارە ڕازیدەبێت و دەچێتە فێرگەی سەربازییەوە.

شایانی باسە کە پێنج ساڵ دواتر لە ۱۹۲۲دا نازم و جەمال پاشا لە مۆسکۆ یەکدی دەبیننەوە. جەمال پاشا وەك جاران داوا لە نازم دەکات، کە هۆنراوەیەکی بۆ بخوێنێتەوە و نازم بۆی دەخوێنێتەوە. یەکسەر ڕوخساری پاشا دەشێوێت. ناچار بێدەنگییەکەی دەشکێنێت و دەڵێت "ئەگەر ڕێوشوێنی جارانم هەبووایە، داوامدەکرد لەسێدارەتبدەن و لەژێر سێدارەکەدا دەگریام."

نازم وەڵامی دەداتەوە "بەڵام جیاوازی من و تۆ ئەوەیە، کە من تۆم لەسێدارەدەدا و نەشدەگریام."

ئەوەی لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا نازم چی بەسەر هاتبوو و چۆن نەوەی پاشا گەیشتبووە مۆسکۆ و بووبووە هۆنەرێکی شۆڕشگێڕ. ئەمە کورتەی ڕووداوەکانی ئەو پێنج ساڵەیە :

نازم فێرگەی دەریایی تەواوکرد و بۆ خولی کردەیی [پراکتیک] چووە هێزی دەریاییەوە، بەڵام پاش تووشبوونی بە pleuritis سییەکانی بە خەستی خڵت دەگرن و لە خزمەتکردن لەنێو هێزی دەریاییدا لێیدەبوورن.

ساڵی ١٩٢٠، دوو ساڵ بەسەر کۆتایی جەنگدا تێپەڕیوە. دەوڵەتی ئوسمانی لە جەنگدا شکستی خواردووە و گشت وڵاتە بندەستەکانی ئەو ئیمپراتۆرییە ئازادکراون و لەو ئیمپراتۆرییە پانوپۆڕە تەنبا خاکی بنەڕەتی تورکیە واتە ئاسیای بچووك ماوەتەوە. بەڵام لەم سنوورە فەرمانڕەواییە بچووکەشدا، ئیدی سەربەخۆی بوونی نەبوو. سوڵتان موحەمەد'ی پێنجەم لە دەسەڵات خۆی کێشایەوە و سوڵتان موحەمەد'ی شەشەم لە جێی ئەو چووە سەر تەخت. ئیستانبول لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە داگیرکرابوو، (بابعالی) و کۆشکی دۆلما باخچە DOLMABAHÇE SARAYI لە بێدەنگییەکی مەرگباردا نوقم بووبوو و دوا ئیمپراتۆریی ئوسمانی لە دەستی هێزە داگیرکەرەکاندا وەك بووکەشوشەیەك لێهاتبوو. گەل بەگشتی لە سوڵتان تەمابڕ بووبوون و گشت چاویان بڕیبووە ئاناتۆڵی و بەرەو موستەفا کەمال پاشا، کە لە ئانکارا (هێزی میللی)ی دادەمەزرێنێت و دەکەوێتە مەوڵی ڕزگارکردنی وڵات لەدەست بێگانەکان. داهاتوو لە ئاناتۆڵی'یە، هیوا لە ئاناتۆڵی'یە، پەیوەندی دەوڵەت لە ئاستانبول لەتەك ئاناتۆڵی'دا پچڕاوە و ئەو کەسانەی کە هۆگری ڕزگاری نیشتمانن، ڕوو دەکەنە ئانکارا.

لەم ساڵەدا نازم حیکمەت'ی مەژدە ساڵە لە کۆڕ و کۆمەڵە هونەرییەکانی ئیستانبول'دا وەك هۆنەرێك زۆر ناسراوە. هۆنراوەکانی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا چاپدەکرێن، لە پێشبڕکێی هۆنراوە'دا بەشداریدەکات و براوە دەبێت. بەڵام بۆ ئەو ژیان لە ئیستانبول کە لەژێر پۆستاڵی داگیرکەراندایە، شیاوی بەرگەگرتن نییە. دواجار بڕیاری خۆی دەدات. بەبێ ئەوەی لەم بارەوە لەتەك باوکی قسانبکات، لەتەك یەکێك لە هاوەڵە دڵسۆزەکانی والا نورەدین گەشتی خۆی بۆ ئاناتۆڵی دەستپێدەکات. لەم گەشتەدایە، کە بۆ یەکەم جار نازم ڕوخساری کەتواریی

نیشتمان و گەلەکەی خۆی دەبینێت. یەکەمین جارە کە لەتەك ژیانی کولەمەرگی ژنان و منالانی برسی و ڕووتەڵە و نەخۆشی نیشتمانەکەی خۆیدا ئاشنادەبێت. نازم تا کۆتایی تەمەنی هەرگیز ناتوانێت ئەوەی کە لە ئاناتۆڵی بینیویەتی لەبیربکات و لەوەو بەدواوە، گشت هۆنراوەکانی ئەو سروش لە ژیانی ئەم خەڵکەوە وەردەگرن و بۆ ئەو خەڵکە دەبن.

نازم و والا لە ئیستانبول'ەوە چوونە ئینەبولو و لەوێوە بە پێخاوسی بەنێو گوندی وێران و خەڵکی نەخۆش و برسیدا ڕێگەی ئانکارا'یان گرتەبەر. ئەم گەشتە، حەوت ڕۆژ درێژەی کێشا. ئانکارا لەنێو هەژاری و بەدبەختی و بێچارەییدا خەریکبوو نوقمدەبوو، بەڵام هۆنەری لاو ڕێگەی خۆی هەڵبژاردبوو؛ دەیویست لە جەنگی سەربەخۆییدا بەشداریبکات. هەوڵێکی زۆری دا، بەڵام ئەوییان وەرنەگرت، کەسانێك بوون، کە دەیانزانی سییەکانی ئەو نەخۆشن و پێشتر لە خزمەتی سەربازی لێیبودراوە. خزم و کەسانێك، کە لە ئانکارا هەیبوون، هەوڵیاندا تاوەکو کارێکی گونجاوی لە نووسینگەی چاپەمەنی ئانکارا بۆ پەیدابکەن. بەڵام نازم ڕازینەبوو و ئەو ویستی بینێرنە جەنگ یا وەك مامۆستا بنێرنە گوندەکانی ئاناتۆڵی. بەم هۆیەوە دەیویست خەڵکی ئاناتۆڵی باشتر و زۆرتر بناسێت. ئەویان نەنارده جەنگ، بەڵام توانی بەپێداگرتنێکی زۆر، فەرمانی مامۆستاییەکەی لە لادێی بولو بەدەستبێنێ و هاوەڵەکەشی والا کەوتە دوای ئەو و هەدووك چوونە بولو.

لە هاوینی١٩٢١دا نازم و هاوەڵەکەی بەپێ کەوتنەڕێ. نازم لە نیوەی ڕێدا نەخۆشکەوت و بە خزمەتگەریی گوندنشینان چاکبووەوە و دواجار ماندوو و نیوەگیان، گەیشتنە بولو.

مامۆستایی لە بولو ئەوی زیاتر لە خەڵکی هەژار و لێقەوماوی ئەو ناوچەیە نزیکدەکردەوە. هەرچەندێك پەیوەندی خەڵکی لەتەك نازم'دا زیاتردەبوو، زەنگی مەترسی بۆ ئاخا و سەرۆکهۆزە ناوچەییەکان دەزرینگایەوە، بەجۆرێك کە سەرئەنجام بڕیاڕی کوشتنی ئەویان دا و ئەگەر یارمەتی ضیاء حلمی فەرمانداری بولو نەبووایە، کە کەسێکی ڕۆشنبیر بوو، لەوانەیە پەڕاوی ژیانی هۆنەر [نازم حیکمەت] هەر لەو گوندە دووردەستەدا داخرایە. ضیاء حلمی دەستبەجێ نازم و هاوڕێکەی لە بولو دەربازکرد و بردنیە گوندێکی ئاو و هەوا خۆش لەو نزیکانە. نازم لەوێندەرێ ژیانێکی تا ڕادەیەك ئاسوودەی هەبوو و دەیپەرژایە سەر خوێندنەوە و نووسین و هۆنینەوەی هۆنراوە. لە ضیاء حلمی'یەوە فێری فارسی دەبوو و هەروەها خەریکی باشتر فێربوونی زمانی فەرەنسی دەبوو، کە لە منالیدا لە دایکییەوە فێربوو بوو. لەنێو ئەو

پەرتووكانەی كە دایكی بۆی ناردبوو، چەند پەرتووك لەبارەی شۆڕشی فەرەنسە' هەبوون، كە نازم بە هۆگرییەوە دەیخوێندنەوە و بەردەوام ئارەزومەندبوو، كە شۆڕشێك وەك شۆڕشی فەرەنسە لە وڵاتەكەی ئەویشدا ڕووبدات، بەڵام ضیاء حلمی ئەوی لەم خەون و خەیاڵە دەرهێنا و پێیگوت كە " ئەو شۆڕشە ئیدی بەسەرچووە. شۆڕشێكی گەورەتر و قوڵتر لەم وڵاتە هاوسێیەماندا لە ڕوسیە ڕویداوە و سەیرە كە هێشتاكە ئێوە لە ئارەزوو و خەونی شۆڕشی بۆرجوازی فەرەنسەدان." ئەم وتانە و قسەوباسی دوورودرێژ، كە بەدوای ئەوەدا پێكەوە هەیانبوو، بەرە بەرە نازم'یان لەژێر كاراییی شۆڕشی فەرەنسە ڕزگاركرد و بیر و سەرنجی ئەوی بەلای شۆڕشی ڕوسیە'دا شكاندەوە. ئیدی نازم و هاوەڵەكەی والا لە جیاتی فەرەنسە و پاریس دەیانویست بچنە ڕوسیە و بەتایبەت مۆسكۆ.

دواجار بڕیاری یەكجارەكی خۆیان دا و ضیاء حلمی'یش لەم بارەوە كۆمەكیكردن. تەنانەت خودی ئەو پێگوتن كە لەتەكیاندا دێت و پێكەوە ئامادەبوون. ضیاء حلمی لە تەرابزون مایەوە و ئەوان بە بەرگەگرتنی دژوارییەكی زۆر، خۆیان گەیاندە باتوم.

نازم هیچ پارەیەكی لە گیرفاندا نەمابوو، لەبەرئەوەی بیستبووی كە لە ڕوسیەی بۆلشەڤیكیدا، ئیدی پارە ڕواجی نییە، گشت پارەی پاشەكەوتی خۆی خەرجكردبوو و دابوویە گوندنشینەكان. بەڵام لە باتوم نازم ناچار بە فرۆشتنی پۆتینەكانی بوو و پاش چەند ڕۆژ سەرگەردانی ڕۆیشتنە تفلیس. لێرەش ڕێكەوت كۆمەكی پێكردن، لەتەك یەكێك لە ناودارانی تورك ئەحمەد جەواد ئیمرە، كە چەند زمانێكی دەزانی و فێركاری زانكۆ بوو، ئاشنا بوون و ئارەزووی خۆیان بۆ ڕۆیشتن بۆ مۆسكۆ و خوێندن لە زانكۆ لەتەك ئەودا باسكرد. بەڕێكەوت لەو ڕۆژانەدا پێشنیارێك لە مۆسكۆوە بۆ ئەحمەد جەواد ئیمرە هاتبوو، كە ئەویان بۆ وانەگوتنەوە لە ئەنیسیتوتی خۆرهەڵاتیی مۆسكۆ بانگەواز كردبوو. ئەحمەد جەواد لە وەڵامدا نووسی، كە ئەو دوو هاوەڵی لاوی لەتەكدایە و پێكەوە خێزانێكی كۆمەڵایەتییان پێكهێناوە. ئەم دوو لاوە ئارەزووی خوێندنیان لە زانكۆی مۆسكۆ هەیە. لەبەرئەوەی كە پێویستیان بە كۆمەكی ئەو هەیە. بەو جۆرە دەیەوێت ئەوان لەتەك خۆیدا بباتە مۆسكۆ. پێشنیارەكەی پەسەندكراو و خەرجی خوێندنی نازم و والا دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆلشەڤیكی لە ئەستۆی گرت، بەو مەرجەی كە لە ڕۆژانی پشووی زانكۆدا بڕۆنە گوندەكان و لە كێڵگەكاندا كار بكەن.

# له نۆزده ساڵیدا خوێنکاری زانکۆی مۆسکۆ بووم

نازم و والا چوونه زانکۆی گەلانی خۆرهەڵات  له مۆسکۆ و له بەشی زانستی ڕامیاریدا دەستیان بە خوێندن کرد. لەم زانکۆیەدا فێرخوازانی زۆرێك لە وڵاتانی ئاسیایی خەریکی خوێندنن و نازم و والا نەخشەی ماوەڵێتی لەتەك ئەواندا دادەرێژن: ئێس جیب وەفا  خەڵکی هیندوستان، سی- یا – ئو خەڵکی چاینا، لاموتی'ی هۆنەر خەڵکی ئێران و سلێمان ڕۆستەم هۆنەرێکی دیکه خەڵکی ئازەربایجانی سۆڤیەت، ناسراوترینیان بوون.

لەم دەوروبەره فێرخوازییەدا چوار کەس له گشتیان لەیەکەوە نزیکترن، که بەزۆریی پێکەوه ژیانیان دەگوزەراند. عابد عالمۆف (ناسراو به پتروسیان )، کوڕی یەکێك له موسوڵمانانی کریمە'یه و چەند زمان دەزانێت و به تورکی وەك زمانی دایکیی خۆی قسەدەکات. ئەو زۆر هاریکاریی نازم دەکات و له گشت گرفتەکانیدا یاوەری دەبێت. عالموف هۆنراوەکانی نازم وەردەگێڕێته سەر زمانی ڕوسی و دەبێته هۆی ئەوەی، که نازم له کۆڕ و کۆمەڵی ئەدەبیدا ناوبانگ پەیدابکات. نازم لەو هەموو گەشت و نیشتەجێبوون و سەرگەردانییانەیدا تەنیا شتێك، که هەرگیز فەرامۆشینەکرد، هۆنراوە هۆنینەوە بوو و ئەو بەخۆی دەبێژێت " به ڕادەی بارانێك، که بەدرێژایی ساڵ له مۆسکۆ دەبارێت، هۆنراوەم گوتووە". بەڵام عالموف تووشی وەرەم بوو و چەند مانگێك زیاتر نەژیا.

سی- یا – ئو فێرخوازی چاینی، که ئارەزووی گەڕانەوەی بۆ چاینا و پشتیوانیکردنی شۆڕشی نیشتمانەکەی هەیه. ئانوشکا کیژێکی ڕوس، که باوکی سەربازانی جەنەڕاڵ کولچاك، که له دژی فەرمانداریی [حکومەتی] تازەی بۆلشەڤیکی دەجەنگا، له پێش چاوی گولەبارانیکردووه و کوشتبووی و دواتر دایکی به نەخۆشی تیفوس Typhus مردووه. نێوانی ئانوشکا و سی- یا – ئو سۆزدارییەکی فراوانی ئامێته به خۆشەویستی هەبوو، بەڵام سی- یا – ئو فرەتر له خۆشەویستی بیری لەلای ڕزگاری خەڵکی نیشتمانەکەی بوو. لەبەرئەوە ئەوان بەجێدەهێڵێت و دەگەڕێتەوه چاینا و زۆری پێناچێت، که هەواڵی سەربڕینی ئەو لەلایەن داگیرکەرانی نیشتمانەکەیەوه دەگات. عالموف'یش بەجۆرێکی دیکه دەمرێت. شەوێك وەك هەمیشه شاد و خەندان دەچێته کۆڕی دۆستانەی ئەوان و بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، له بارەی مەرگەوه دەدوێت و پاش ساتێك [الساعة]، له کاتی چوونەخوارەوەدا له ئاپارتمانەکەوە، که له نهۆمی

چوارەمە، وەك هەمیشە بە خلیسكانێ بە مەحجەرەی پێپلیكانەدا بەرەو خوار خۆی دەخزێنێت، پاش كەمێك ماوەڵەكانی لەبەردەم پێپلیكانەكانی نهۆمی یەكەمدا مێشك پڕاو و بێگیانكەوتوو، دەیبینن.

ئانوشكا و نازم كە شەیدایانە یەكدییان خۆشدەوێت، تەنیا دەمێننەوە، بەڵام مەردەم سێبەری سی- یا – ئو لەنێوانیاندایە و نازم'یش وەك سی- یا – ئو ئارەزووی گەڕانەوەی بۆ نیشتمانەكەی و ڕزگاركردنی توركیەی هەیە، تەنانەت لە بەرانبەر پێشنیاری ئاشكرای ئانوشكا بۆ هاوسەریكردن لەتەك ئەو، خۆی لادەدات.

لەم نێوەدا كیژێكی تورك بەناوی نەزهەت، كە لە خزمانی دوور و ناسیاوانی خێزانی نازم'ە و لە زانكۆی مۆسكۆ دەخوێنێت، لە نازم نزیكدەبێتەوە و ناسیاوی پێشتریان دەگۆڕێت بە خۆشەویستی و دواتر دەبێتە هاوسەری. لەم كاتەدا نازم تەمەنی ٢١ ساڵە و خۆی واتەنی دێوێكی چاوشین'ە، كە ئارەزووگەلێكی دێوئاسای لە سەردایە و ئارەزووی كیژۆڵەیەك، كە خۆزگەی خانوویەكی گچكە و باخچەیەكی پڕ لە زەردەگوڵی یاسەمینی هەیە، ناتوانێت ئەم سەودایانە بێت. لەبەرئەوە هاوسەرییەكەیان ساڵێك درێژەناكێشێت، كیژۆڵەكە ئەو بەجێدەهێڵیت و دەگەڕێتەوە ئیستانبول و ئەمە كۆتایی یەكەمین هاوسەرگیریی نازم دەبێت.

هۆنراوەی "دێوی چاوشین و ناسكە ژنی خنجیلە" لەبۆماوەیەكە، كە لەم هاوسەرییە ماوە كورتەدا بۆ ئەدەبیاتی تورك بەجێماوە. ئەم هۆنراوەیەی نازم حیكمەت لە پلەی یەكەمدا نیشانەی گەیشتنی ئەوە بە قۆناخی پێگەییی هۆنەرانە و نموونەیەكە لە هۆنراوە درەوشاوە یەكەمینەكانی ئەو، كە تیایاندا ئاوازی موزیكی هۆنراوەی دیوانی لەتەك پەیڤینی سادە خەڵك تێكەڵكراوە و شێوازێكی نوێی لە هۆنراوەی توركی'دا داهێناوە

ئەو دێوێكی چاوشین بوو
شەیدای ناسكە ژنێكی خنجیلە بوو
خەونی ژنە خانوویەكی گچكە بوو
كە لە باخچەكەیدا
چڵە یاسەمینی زەرد

گوڵی کردبێت
دێو، دێوئاسا خۆشیدەویست و
دەستانی دێو بۆ جورە کارانێکی گەورە
چێکرابوون
کە نەیدەتوانی خانووی گچکە ڕۆبنێ و
لە دەرگەی خانووی گچکە بدا
خانوویەك کە لە باخچەکەیدا
زەردەگوڵی یاسەمین
پشکوتووبێ
ئەو دێوێکی چاوشین بوو
شەیدای ناسکە ژنێکی خنجیلە بوو
نسکە ژنی خنجیلە
تاسەی ئارامی کرد
لە نێوەڕێی دووردورێژی دێودا ماندووبوو و
ماڵئاوایی لە دێوی چاوشین کرد و
قۆڵی لە قۆڵی کورتەباڵایەکی دەوڵەمەند نا
چووە خانوویەك، کە زەردەگوڵی یاسەمین
لە باخچەکەیدا
پشکوتووە و
ئێستاکە ئیدی دێوی چاوشین باش دەزانێت
کە خانوویەك کە چڵە یاسەمینی زەردەوە
لە باخچەکەیدا پشکوتووە
بۆ ئارەزووە دێوئاساکان
تەنانەت ناتوانێت گۆڕیش بێت

نەوتراو نەمێنێتەوە، نازم لە تەواوی ئەو ماوەدا بەشێوەیەکی بەردەوام نامەی بۆ باوکی و دایکی و سامیە'ی خوشکی دەنووسی و دەنارد ... نامەکانی نازم حیکمەت، بۆخۆیان کۆمەڵێکی سەرنجڕاکێشن. بەڵام لە لەوێنەبوونی نازم'دا باوکی و دایکی لەیەك جیابوونەوە و دایکی نازم جەلیلە خاتوون، لە پاریس دەژی و درێژە بە وێنەکیشان دەدات.

لەم کاتەدا جەنگەکانی سەربەخۆیی لە تورکیە کۆتاییانهاتووە. موستەفا کەمال پاشا لە هەموو بەرەکاندا لەوانە بەرەی ڕامیاریدا سەرکەوتووبووە و داگیرکەران ئیستانبول'یان بەجێهێشتووە و ئیزمیر'یش لەلایەن سوپای میلی'یەوە ڕزگارکراوە، ڕژێمی پاشایەتی هەڵگەڕاوەتەوە و دوا پاشای ئوسمانی دەرکراوە و فەرمانداریی کۆماری لە تورکیە ڕاگەیێندراوە. موستەفا کەمال پاشا لەلایەن ئەنجومەنی گەورە'وە وەك یەکەمین سەرۆككۆماری تورکیە هەڵبژێردراوە و نەتەوەی تورك نازناوی "بابی تورك"ی پێبەخشیوە.

نازم حیکمەت درێژە بە خوێندنی خۆی دەدات. لە دواساڵی زانکۆدایە، کە لێنین دەمرێت و ئەو وەك نوێنەری زانکۆکەیان،مۆڵەتی پێنج خولەك پاسەوانی لە تەنیشت جەنازەکەی لێنین'ی پێدەدرێت؛" (لێنین)م نەدیتووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٤دا پاسەوانی جەنازەکەی ئەوم کردووە."

دواجار ساڵێك دواتر، واتە لە ساڵی ١٩٢٥دا نازم دەگەڕێتەوە ئیستانبول و بە باوکە پیر و خوشکەکەی، کە بەهۆی دووبارە بینینەوەی ئەوەوە ئەشکی شادییان دەڕێژا، گوت " ئیدی هیچی دیکە لە ئێوە دانابڕێم". بەڵام هیچ یەك لەوان لەو ساتەدا نەیاندەزانی کە ئەمە هێشتا سەرەتایی دابڕانەکانە.

نازم حیکمەت، ئیدی ئەو لاوە ٢٥ ساڵانە نییە، گۆڕانگەلێکی زۆری جەستەیی و گیانیی لەودا دەرکەوتوونە و ئەو گۆڕانانە لە هەمووی زیاتر لە هۆنراوەی ئەودا بەدیدەکرێن.

نازم دەستەبەجێ پاش هاتنی بۆ ئیستانبول، دەکەوێتە بڵاوکردنەوەی هۆنراوەکانی و دەیەوێت ئەوەی کە لە سەرزەمینی شۆڕشی ڕوسیە'ی سۆڤیەتی فێربووە، لە تورکیە پیادەیبکات.... لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا هۆنراوە بڵاودەکاتەوە و لە کۆنفرانسەکاندا بەشداریدەکات. کاری سەرەکی ئەو بەشدارییکردن بوو لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری "ڕۆشنبیران Aydisnlik "

بەڵام دەستبەجێ کاردانەوەکان دەستیانپێکرد ... یەکەمین ئاگادارکردنەوە لە دوور و نزیکەوە بەرگوێ دەکەوت : دەیانپرسی، کە چی دەوێت؟ پلەوپایە؟ ناوبانگ؟ یا پارە؟ ... دەتوانرێت گشت بۆلوانەکان بخرێنە بەردەستی. بەو مەرجەی، کە بۆ چینی خێزانەکەی خۆی وەفادار بمێنێتەوە و لە بیری هوشیارکردنەوەی چینە بێبەشەکاندا نەبێت. بەڵام هەر لە ڕۆژانی یەکەمەوە، ئەویان دیتبوو، کە لەتەك ماوڕێکانی لە گەڕەکی هەژارنشینی "قاسم پاشا" لەسەر پردەکە ڕۆژنامەی سۆشیالیستی دەفرۆشێت.

پاش ئاگادارکردنەوەکان و بۆلوانبەخشینەکان، نۆرەی هەڕەشەکان دێت. بەڵام نازم گوێی لە هیچ یەك لەوانە نەبوو و ڕێگەی خۆی گرێتەبەر... فشارەکان لە ئیستانبول ڕۆژ بە ڕۆژ توندتر دەبن و نازم بۆ ئەوەی بتوانێت ئازادانە درێژە بەکارەکەی خۆی بدات، دەچێتە ئیزمیر.

لەم کاتەدا لە ئیستانبول دەستگیرکردنەکان دەستیانپێکردووە و سەرەنجام ئەویش دەکەوێتە ژێر چاودێرییکردن و نووسین و هۆنراوەکانی ئەو لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا وەك بەڵگە لە دادگە دەخرێنەڕوو و داواکاریی سزای قورسی زیندان بۆ ئەو دەکەن. خودی نازم لە ئیزمیر'ە و بەنهێنی ژیان دەگوزەرێنێت. لە ئیستانبول لە لەوێنەبوونی خۆیدا دادگەییدەکرێت و پانزە ساڵ زیندان سزادەدرێت.

پۆلیس لە دوی نازم دەگەڕێت. لە ئیستانبول ئابلۆقەیماڵی باوکی دەدەن. باوکی دەستگیردەکەن و دەیبەنە پۆلیسخانە و داوای درکاندنی شوێنی خۆشاردنەوەی نازم'ی لێدەکەن، بەڵام هیچ بەدەستناهێنن. خوشکەکەشی دەستگیردەکەن و لێپرسینەوەی لەتەکدا دەکەن، بەڵام هەر ناتوانن سەرەداوێك لەمەڕ شوێنی خۆشاردنەوەی نازم بەدەستبهێنن.

لەم ماوەدا نازم بەنهێنی لە ئیزمیر'ەوە دێتە ئیستانبول و چەند ڕۆژێك لەلای دایکی دەمێنێتەوە. بە دایکی دەڵێت "دایکە، پازدە ساڵ زیندان سزایانداوم، پازدە ساڵ لە پشت دیواری زیندان، لە کاتێکدا کە هیچ تاوانێکم نییە، ئەوپەڕی گەمژەییە، مەگەر من مرۆڤم کوشتووە، دزیم کردووە،نیشتمانم فرۆشتووە یا دژەخونیم لە نیشتمان کردووە ؟ ........ هیچکام ! ... ئەوان دەیانەوێت پازدە ساڵ من بێدەنگبکەن. بەڵام من کە تاوانێکم نەکردووە، لەبەرئەوە وەها سزایەك پەسەندناکەم و هەرگیز ملیپێنادەم. ناچارم نیشتمانم بەجێبهێڵم. ... ئێستا گوێم بۆ ڕادێرە دایە، تۆ نیگارکێشی، بەو بۆنەوە ئارایشکردنیش شارەزای. دەبێت ئێستا ئاوا ڕوخسارم بگۆڕیت، کە نەك تەنیا دوژمنەکانم، بەڵکو دۆستەکانیشم نەمناسنەوە".

جەلیلە خاتوونی دایکی، گشت هونەری خۆی لە گۆڕینی ڕوخساری ئەو خستەکار. نازم بە ڕوخساری تازەیەوە، بەخێرایی ماڵئاوایی لە دایکی کرد و بە شەو بە بەلەمێکی مۆتۆری کە بەگوێرەی ڕێکەوتنی پێشتر چاوەڕێی بوو، لە بوگاز بسفر چووە دەریای ڕەش و لەوێوەش بە کەشتی بەرەو ڕوسیە بەڕێکەوت.

نازم حیکمەت دوو ساڵ دیکە لە مۆسکۆ مایەوە و لەم ماوەیەدا بە پەیگیرییەکی تەواوەوە، شەو و ڕۆژ خەریکی هۆنراوە و شانۆ و ڕۆماننووسی بوو. لەم کاتەدا لەتەك موحسن ئەرتوگرول یەکێك لە پێشڕەوانی شانۆی هاوچەرخی تورکی، کە دەرهێنەر و هونەرمەندێکی بەتوانا بوو، یەکدیان ناسی و ئەم ناسینە دواتر لە تورکیە بووە هۆی هاریکاریی ئەم دووانە، موحسن ئەرتوگرول یەکەمین کەسێك بوو، کە شانۆنامەکانی نازم حیکمەت'ی لە تورکیە بردە سەر شانۆ.

نازم لەم ماوەدا لەتەك دووەمین هاوسەری لێنا کە پزیشك بوو، ئاشنابوو و هاوسەرییکرد. کاتێك کە لە تورکیە یاسای لێبوردنی گشتی پەسەندکراو و ئەم یاسایە تاوانباریی ڕامیاریشی گرتەوە، نازم لەلایەن خێزانەکەیەوە ئاگادارکرایەوە، کە ئەویش بەر لێبوردنی ئەو یاسایە دەکەوێت. نازم بڕیاری گەڕانەوەی دا و خواستی هاوسەرەکەشی لەتەك خۆیدا بۆ تورکیە ببات، بەڵام ڕووبەڕووی گرفتگەلێك بووەوە، کە یاسا و بڕیارە سەروەرەکانی ئەو کات لەسەر ڕێی ئەو دروستیانکردبوون. ناچار نازم خۆی بەتەنیا گەڕایەوە نیشتمان. بەڵام سەرەڕای یاسای لێبوردنی گشتی، هەر کە پێینایە خاکی تورکیە، لە گوندێکی سەرسنووریی هوپ دەستگیرکرا و زنجیر لەدەست، ڕەوانەی زیندان کرا. لەکاتی دەستگیرکردنیدا گیرفانەکانی گەڕان و پارچە کاخەزێکیان دۆزییەوە، کە تێیدا نازم دوایین هۆنراوەی بەناوی " لە خەونی هیراکلیت'دا " نووسیوبوو. لەو سەردەمەدا هەرچەندە یاسای گۆڕینی ڕێنووس پەسەندکرابوو، بەڵام خوێندن و نووسین بە پیتی لاتینی بەتەواوی لەنێو خەڵکیدا گشتیی نەبووەوە. نازم'یش هێشتاکە هۆنراوەکانی بە پیتی عەرەبی دەنووسین. لەم ڕێنووسەدا هراکلیت بە هراقلیت دەنووسرا و کارمەندی لێپرسینەوە، کە وەها ناوێکی نەبیستبوو، بە " هر اقلیت / هەر کەمینەیەك"ی تورکی خوێندبوویەوە و بە خەیاڵی خۆی باشترین بەڵگەی لەسەر نازم بەدەستهێنابوو و لە ڕاپۆرتەکەیدا نووسی " ئەو لە بیری هەموو کەمینە نەتەوەییەکاندایە و دەیەوێت بۆ یاخیبوون هانیانبدات ".

نازم هەوڵیدا ئەو کارمەندە بەدبەخت و پەیگیرە تێبگەیێنێت، کە هراقلیت فیلۆسۆفێکی یۆنانییە، بەڵام ئەو ڕۆشنکردنەوەیە کارمەندەکەی بەگومانتر کرد و لە ڕاپۆرتەکەیدا ئەم ڕستەیەشی زیادکرد " لە هەمووی گرنتر ئەوەیە کە دەیەوێت کەمینە یۆنانییەکانیش بۆ یاخیبوون لە دژی فەرمانداریی [حکومەتی] نێوەندی هانبدات ".

زیاتر لە دوو مانگ درێژەیکێشا، تا کارمەندانی یاسا، پرسی "هر اقلیت" و "هر اکلیت"یان بۆ ڕۆشنبووەوە. سەرەڕای ئەوەش نازم'یان بە زنجیرەوە بەرەو ئانکارا نارد. و دیسانەوە لەوێش زیندانیکرا. بەڵام ڕۆژنامەکان پرسەکەیان بڵاوکردەوە و لەسەر ئەوە ڕەخنەی توند لە دەوڵەت گیران و زیندانیکردنی هۆنەرێکی ناسراو، وێڕای لەئارادابوونی یاسای لێبوردن بە نادادوەریی بێپەردە ناویانبرد. سەرەنجام دەوڵەت ناچاربوو، کە نازم لە زیندان بکاتەدەرەوە. نازم چووە ئیستانبوڵ پاش چەند ڕۆژ پشوودان، کۆششەکانی خۆی دەستپێکردەوە و کەوتە بڵاوکردنەوەی هۆنراوەکانی و نووسینی شانۆنامە و ڕۆمان و وتار لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا.

ساڵی ١٩٢٩یە، شەشەمین ساڵیادی لەدایکبوونی کۆماری تورکیەیە، بەڵام پاشاییخوازانی خراپەکار و دژەخون لەجێی خۆیاندا ماونەتەوە. فەرمانداریی بووەتە کۆماریی، بەڵام هێشتاکە هزری کۆنە و گەندە لەنێونەچووە و لە وەها بارێکدا هۆنراوە و نووسینەکانی نازم حیکمەت هێرشی قورس دەکەنە سەر ئەوانە و ئەمە دەبێتە هۆی کاردانەوەی ئەوان؛ پێنووسە دەربارەکان وەگەڕدەکەون و نازم بەرەنگاریاندەبێتەوە. لێرەدایە کە تەنزەکانی [ساتیرەکانی] نازم یەك لە دوای یەك لە بەشی ساتیری گۆڤارەکانی مامۆستایانی ناسراوی ئەدەبی و سەرۆکانی سەنگین و ئەنجومەنە ئەدەبییەکاندا بڵاودەکردەوە. ساتیرە-هۆنراوەکانی نازم بۆخۆیان لە شاکارەکانی هۆنراوەی هاوچەرخی تورکیە'ن.

یەکەمین پەرتووکی نازم بەناوی " ٨٣٥ دێڕ" لە ساڵی ١٩٢٩دا بڵاوکرایەوە ئەو هۆنراوانەی ئەوی دەگرتەخۆ، کە لەنێوان ساڵانی ١٩٢٢ تا ١٩٢٨ هۆنیبوونییەوە. ناوی ڕاستینەی پەرتووکەکە (گۆرانی خۆرنووشان) بوو. ئەم پەرتووکە، چێوە [فۆرم] و کرۆکێکی تەواو نوێی بۆ ئەدەبی تورکیە داهێنا، بەوەی کە ڕێسای باوی لە ئەدەبیاتی هۆنراوەدا تێکوپێکدا. زمان و هزر و چێوەی تەواو نوێ بوو. لاوان بە شەیدابییەوە پرپاندایە ئەم پەرتووکە. تۆفانێك کە ئەم بەرهەمە لە کۆڕ و کۆمەڵی هونەرییدا بەرپایکردبوو هێشتاکە نەنیشتبووەوە، کە دووەمین پەرتووکی نازم بڵاوکرایەوە؛ ( ژو کۆندوسی – یا – او ... ) و لەسەر لاپەڕەی یەکەمی

پەرتووکەکە نووسیبووی "بەیادی ماوەڵم ژو کۆندوسی – یا – او ....، کە لە شانگهای سەریان لە جەستەی جیاکردەوە.... "
سەرەڕای هەموو ئەمانە، نازم بێکار بوو و لە دوی کار دەگەڕا. بەڵام لە هیچ جێیەك کاریان بەو نەدەدا؛ نە لە فەرمانگەی دەوڵەتیی و نە لە کەرتی تایبەتی. باوكی نازم بووبووە بەڕێوەبەری سینەمایەك و دەرامەتێکی ئاوای نەبوو. ماڵیشیان هەردەم قەرەباڵخ بوو، لەبەرئەوە حیکمەت بەگ، پاش جیابوونەوەی لە جەلیلە خاتوون، دووبارە هاوسەرییکردبووەوە و لە هاوسەرە تازەکەشی دوو منداڵی هەبوو. دواجار بە هەوڵی والا نورەدین لە گۆڤاری (مانگی وێناکرد) کارێکیان بە نازم دا.

ساڵی ١٩٣٢وە، هەروا نازم خەریکی نووسینی هۆنراوە و بڵاوکردنەوەی باوەڕ و بەرهەمەکانی خۆیەتی و لەلایەکی دیکەوە لەتەك کەسانی کۆنەپارێز مشتومڕی نووسینیی درێژەپێدەدا. ئیدی لە هەموو جێیەك ئەویان وەك هۆنەری گەورە و هەڵکەوتە دەناسی، پەرتووکەکانی و کۆمەڵە هۆنراوەکانی بڵاودەبوونەوە و لەم ساڵانەدا ڕۆمانێکی بەناوی (بەنەرجی بۆچی خۆی کوشت؟) بڵاوکردەوە .

لەم ساڵەدا باوكی نازم دەمرێت و ئەوان واتە نازم و خوشکەکەی ناچاردەبن خانوویەکی بچووك لە دەرەوەی شاری ئیستانبول بەکرێبگرن و لەوێ بۆ گوزەراندنی ژیانیان خەریکی کشتکاریش دەبن. نازم، داوا لە هاوسەری خوشکەکەی، کە لە شارۆچکە کاردەکات، دەکات، تاکو بێتە لایان و هاریکارییان بکات. لە دەرەوەی ماڵەکەیان کێڵگەیەکی گەورە هەبوو، کە بۆ کشتکاریی و چاندن ئامادەیدەکەن پیرایە'ش لەتەکیاندایە و نازم و پیرایە هێشتا هاوسەرییانەکردبوو ... هەموویان لە بەیانییەوە تا ئێوارە بەیەکەوە کاردەکەن و شەوانە پێکەوە دادەنیشن و بە جەستەی ماندووەوە، بەڵام بەگیانێکی شادەوە قسەوباس دەکەن و بۆ ئایەندە نەخشەدەکێشن. ئەم ئارامی و شادییە زۆر درێژەناکێشێت. لەم ڕۆژانەدا، جارێکی دیکە دەستگیرکردنی ڕۆشنبیران و ئازادیخوازان دەستپێکردووەتەوە، ڕۆژێك پیاوانی دەسەڵات دەرژێنە ماڵەکەیانەوە و نازم دەستگیردەکەن و ئەم جارە داوای لەسێدارەدانی بۆ دەکەن. هەرچەندە هێشتا هیچ بەڵگەیەکیان لەبەردەستدا نییە، بەڵام پەرتووکەکانی و نووسینەکانی نازم، کە چاپ و بڵاوکردنەوەیان لەو کاتەدا ئازاد بوو، وەك بەڵگەیەك بۆ تاوانباربوونی دەکێشرێنە دادگەوە.

# لە سی ساڵیدا ویستیان لە سێدارەمبدەن

نازم حیکمەت، لە نامەیەکدا کە لە زیندانەوە بۆ خوشکەکەی دەینێرێت، تێیدا دەنووسێت "دادگەر لە داوانامەکەیدا خوازیاری لەسێدارەدانی من بووە. ئاوای بۆ دەچم، گرفتێك لەم داوانامەدا نەبێت، چونکە ئەو تاوانانەی کە دراونەتە پاڵ من، بەهیچ جۆرێك پەیوەندیان بە منەوە نییە... "

دادگەییکردن پێش نیوەڕۆ و دوای نیوەڕۆش درێژەی دەبێت، پارێزەرەکەی نازم بە هەموو توانایەکییەوە داکۆکی لێدەکات و ئەو بەڵگانەی کە دادگەر بە پشتبەستن بەوان، خوازیاری لەسێدارەدانی نازم بوو، ڕەتدەکرێنەوە، بەڵام ئازادبوونی ئەو بەدەستنایێت. بەو جۆرە سزادەدرێت : سەرەتا بە پێنج ساڵ زیندانی سزایدەدن. پاش داخوازیی بەردانی، دادگەی بورسە بە چوار ساڵ کەمیدەکاتەوە، بەسوودوەرگرتن لە یاسای لێبوردنی گشتی، کە تاوانبارانی ڕامیارش دەگرێتەوە، سێ ساڵی بەر لێبوردن دەکەوێت، بەو جۆرە سزاکەی نازم یەك ساڵی دەمێنێتەوە. لەم کاتەدا نازم ساڵ و نیوێکە کە لە زینداندایە و کاتێك کە ئازاد دەبێت، دەوڵەت شەش مانگ زیندانی قەرزاری نازم حیکمەت دەبێت.

هەرچۆن بووە، نازم لە زیندان ئازاددەبێت، بەڵام لە دەرەوەی زیندان نەیارانی ئەو، چینی خۆشگوزەران و دەوڵەتمەند، کۆنەپەرستان و لایەنگرانی دەوڵەتی زۆرداری و ملهوری نەیانهێشت ئاسوودەبێت، گشت دەرگەکان بەڕوویدا داخران. لە هیچ شوێنێك کاریان بە ئەو نەدا. کەسانێك کە نەیانتوانیبوو لەسێدارەیبدەن، هەنووکە دەیانویست بە بێکاری و سەرگەردانی و دەربەدەری، بێدەنگیبکەن. بەڵام سەرەڕای گشت ئەو فشارانە، نازم نەك بێدەنگنەکرا، بەڵکو زیاتر دەنگیدایەوە و سەراپای نەیارانی هێنایە لەرزین.

نازم بوو بە پڕ خوێنەرترین هۆنەر و نووسەری تورکییە. جەماوەر پەرتووکەکانیان هەروەك پەڕەی زێڕین دەبرد. چاپە یەك لە دوای یەکەکانیان بەخێرایی تەواودەبوون. خاوەن ڕۆژنامە و گۆڤارەکان دیتیان، کە ناتوانن لەو کۆما پارەیە خۆیان دووربگرن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا نابێت نازم لە ڕیزی خۆیاندا وەربگرن. لەو پێناوەدا پێشنیاری هاریکارییان خستەبەردەم. ئامادەبوون گوتار و نووسینەکانی ئەو چاپبکەن و لە جیاتی ئەوە پارەیەکی کەمی بدەنێ. بەڵام مەرجی سەرەکیان ئەوەبوو، کە ئەو واز لە واژۆکردنیان بەناوی خۆیەوە [نازم حیکمەت

بهێنێت و ئازادە هەر ناوێك، کە دەیهەوێت لەژێر گوتار و نووسینەکانیدا دابنێت، بێجگە لەناوی خۆی.

نازم بەوە ڕازیبوو. ئەویش لە بەرانبەردا مەرجێکی هەبوو ؛ کە مافی بچووکترین ئاڵوگۆڕیان لە نووسینەکانیدا نەبێت. نازم، ماوەیەکی زۆر بە نازناوی ئورهان سەلیم'وە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا گوتاری نووسی. لەو سەردەمەدا نووسەرانی ڕۆشنبیری تورکیە هەوڵیاندەدا زمانی تورکی لە کۆتوبەندی وشەی ناقۆڵا و نەسازی عەرەبی، کە زمانی نووسەران و دارێژەرانی دەرباری ئیمپراتۆری ئوسمانی بوو، ڕزگاربکەن. کۆنەوێژان و هۆنەرانی چینە خانەدان و خۆشگوزەرانەکان دژی ئەم ڕێچکە و شێوازە بوون، بەڵام نەوەی نوێی تورك دەیانویست بەو جۆرەی کە ئیمپراتۆری ئوسمانی لە سەرزەمینیاندا بنەوبارگەی کوێربووەوە، ئاوەها زمانی ئاڵۆز و ناقۆڵاش، کە بێجگە لە ژمارەیەکی دیاریکراو بۆ کەسانی دیکە دەرکنەدەکرا و بەگشتی لە زمانێکەوە، کە خەڵکانی ئاسایی لە ژیانی ڕۆژانەدا پێیدەدوان دووربوو، بخریتەلاوە و زمانی تورکی لەو وشە و دەربڕینگەلە سەیر و نامۆ و چواندن و بەکاربردنە بێجێیانە ڕزگاربێت. نازم یەکێك لە پێڕەوانی ئەم ڕێچکەیە بوو. ئەو یەکێك لەو کەسانە بوو، کە زمانی خەڵکی ئاسایی لە جیاتی ئەو زمانە خانەدانیی و دەربارییە باوە بەکارهێنا و لەو پێناوەدا هەوڵیدا و پەخشانەکانی ئەو، ڕۆشنی و باڵاییەکی تایبەتیان بەخۆوەگرت، کە لەنێوان نووسینەکانی دیکەدا دەدرەوشانەوە؛ پەخشانەکانی درەوشاوە و هۆنراوەکانی درەوشاوەتر. لەبەرئەوە بە هەر ناو و نیشانێك کە دەینووسی، خەڵك لە توێی وشەی گوتار و هۆنراوەکانیدا، گوتە جوان و درەوشاوەکانی ئەویان دەناسینەوە و لاوان تێدەکۆشان هەرچی زیاتر لاسایی ئەو بکەنەوە و ڕێگەیەك کە ئەو گرتبوویەبەر، درێژەی پێبدەن.

لە ساڵی ١٩٣٦دا نازم حیکمەت یەکەمین ڕۆمانی خۆی لەژێر نازناوی ئورهان سەلیم بەناوی (خوێن قساندەکات) چاپ و بڵاوکردەوە. لەم ڕۆمانەدا نازم حیکمەت ئەو هەلپەرستانەی، کە لە سەردەمی جەنگی سەربەخۆیی تورکیەدا لە جلوبەرگی نیشتمانپەروەریدا خۆیان بەسەر خەڵکدا سەپاندبوو و زالوئاسا خوێنیان مژیبوون، ناساندبوو و ڕێگەی ڕزگاربوونی لەدەست ئەو ستەمکارە خوێمژانەی، کە بەگوێرەی ڕۆژ ڕەنگی خۆیان دەگۆڕی، نیشاندابوو. ئەو لەو ڕۆمانەدا هەوڵیدابوو، تا بیسەلمێنێت، کە لە بەرانبەر پەستیی و گەندەڵی و ستەمدا، ئەوە تەنیا خوێن نییە، کە قساندەکات، بەڵکو هەستی مرۆڤێکە، کە هاواردەکات.

لە هەمان ساڵدا نازم پەرتووکێکی دیکەی بەناوی (فاشیزم و نەژادپەرستی) چاپکرد. ئەم بەرهەمە لایەنگرانی هیتلەر و ڕەگەزپەرستانی زۆر تورەکرد. چونکە ئەو کەسانە بەرەبەرە خەریکبوون، خۆیان بۆ جەنگی جیهانی دووەم ئامادەدەکرد.

هەروەها لە هەمان ساڵدا، نازم لەتەك خاتوو پیرایە هاوسەریکرد. پیرایە، دوو منداڵەکەشی کە لە هاوسەری پێشووتری بوون، لەتەك خۆیدا هێنایینە ماڵی نازم. ئەمە سێیەمین هاوسەری نازم حیکمەت و درێژترین ماوەی هاوسەری ئەو بوو. ژیان لەتەك پیرایە'دا بیست ساڵ درێژەیکێشا بەڵام لەو بیست ساڵەدا، نازم سیازدە ساڵی لە زینداندا بردەسەر. نامەکانی نازم بۆ پیرایە، کە زۆربەیان بە زمانی هۆنراوە بوون، لە ئەدەبی تورکیدا پێگەیەکی گرنگیان هەیە.

بەو جۆرە ساڵی ١٩٣٨ نزیکبووەوە. پانزەهەمین ساڵڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماریی نزیکدەبووەوە. دونیا بەخێرایی بەرەو کارەساتی ترسناکی جەنگی جیهانی دووەم هەنگاویدەنا. لە هەموو شوێنێك بۆنی barووت دەهات. ئەتاتورك لە جێدا کەوتبوو، هیوایەك بە زیندووومانی نەمابوو و دوارۆژەکانی تەمەنی دەبردەسەر. عیسمەت ئینونو خەریکبوو، خۆی بۆ دەوڵەت گرتنەدەست ئامادەدەکرد.

نازم حیکمەت و ئازادیخوازانی دیکەی تورك، هەستیان بە مەترسییەك دەکرد، مەترسی لە پشت سەریانەوە بوو و دەنگی پێی ئەویان دەبیست. نازم ڕۆژبەڕۆژ چالاکییەکانی خۆی زیاددەکرد. هاوەڵانی ئاگاداریاندەکردەوە و دوژمنانی پیلانیان بۆ دادەڕێژا، بەڵام ئەو هەروا بەبێ گوێدانە ئەو پرسانە سەرگەرمی کاری خۆی بوو و ڕوو لە مۆسۆلینی و فاشیزمی فەرمانڕەوا بەسەر ئیتالیادا لەژێر ناونیشانی ( نامەگەلێك بۆ تارانتابابو ) پەرتووکێکی نووسی و بڵاویکردەوە:

تارانتابابو ژنێکی حەبەشی ڕەشپێستە. هاوسەرەکەی بۆ خوێندن چووەتە ئیتالیا، بەڵام ماوەیەکی کورت فاشیستە بەڕەڵاکان، ئەویش وەك زۆرێکی دیکە لەسێدارەدەدەن. بەڵام پێش مردن نامەگەلێکی بۆ هاوسەرەکەی تارنتابابو ناردووە:

" مۆسۆلینی، زۆربلێیە، تارانتابابو !
هەروەك منالێ
کە بە تەنیا
لە تاریکیدا بەڕەڵایانکردبێ ... "

ئەم پەرتووکە سیازدە نامەی بۆ تارانتابابو تێدایە، کە جوانترین و ڕەوانترین هۆنراوەی ڕامیاریی نازم حیکمەت'ی تێدایە، کە تێیاندا ڕوخساری ڕەشی فاشیزمی مۆسۆلینی بەشێوەیەکی ترسێنەر نوێندراوە. ئەم هۆنراوەی خوارەوە یەکێکە لە جوانترینی ئەو نامانە :

" ئەوێك كە لە گەردنیا
ملوانكەیەك لە ددانی شینباوی مەیمونی لە گەردندایە
ئەوێك بە وێنەی باڵداری لەژێر ئاسمانا و
وەك ئاوی ڕەوان لەسەر زەوی ژیان دەكا
چاوانی ئاوێنەی مسینی چاوانم
دایكی سێیەمین كوڕ و پێنجەمین كچم
تارانتابابو!
دەرگەیەك نەما نەیكوتم
كۆڵان بە كۆڵان
ماڵ بە ماڵ
لە ڕۆما
لە دوی سۆز گەڕام. "

وەك پێشتر گوتمان، دوژمنانی ئازادی نووسین و دەربڕین، دوژمنانی هەموو مرۆڤێکی ئازادبیر و ئازادیخواز، بۆ نازم حیکمەت نەخشەیان داڕێژابوو. ئەوان لە شێوازی کاری دادگەکان ڕازینەبوون. لە دەستگیرکردن و زیندانیکردنەکانی پێشووتری نازم حیکمەت ڕازینەبووبوون. دادگە ناسەربازییەکان زۆر دڵنەرم بوون و هەندێك جار، هەرچەندە کەمیش بووایە، یاساکانیان پێڕەودەکرد. بۆ نموونە مۆڵەتیان بە پارێزەرەکەی نازم حیکمەت دەدا، تا داکۆکیی لێبکات! بەڵام ئەم جارە باشترین شێوازیان ئەوەیە، کە نازم بە دادگە سەربازییەکان بسپێرن. دادگە سەربازییەکان بە باشی دەتوانن، بەر بە نازم و هاوڕێکانی بگرن و دادگاییان بکەن.

## ساڵانی نێو زیندان : لە سی و شەش ساڵیدا شەش مانگ لەنێو چوار مەتر چوارگۆشەدا لە هەوڵ و چاوەڕوانیی دەرچووندا بووم ..

١٧ی جێنوەری ١٩٣٨، شەوێکی زستانییە، لە ئیستانبول، نازم حیکمەت لە ماڵی یەکێك لە خزمە نزیکەکانی میوانە. خواردنی ئێوارەیان خواردووە و خەریکی گاڵتەوگەپن، لەناکاو بە توندی لە دەرگەی ماڵ دەدرێت. خاوەنماڵ پەشۆکا و هەراسان دەرگە دەکاتەوە. پۆلیس دێنە ژوورەوە و بەبێ هیچ جۆرە پرسیار و وەڵامێك، نازم حیکمەت دەستگیردەکەن و لەتەك خۆیان دەیبەن. چەند ڕۆژێك لە ئیستانبول ڕایدەگرن و دواتر دەیگوێزنەوە بۆ ڕاگرتنگەی سەربازیی [زیندانی کاتیی سەربازی] .... بەبێ هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەك، بەبێ ئەوەی تەنانەت یەك وشە قسە لەتەك ئەو بکەن، چەند مانگ لە ژوورێکی زیندانی تاکەکەسیی بچووك و نیوە تاریك دەیهێڵنەوە و تەنیا لەتەك پاسەوانێك لەبەر دەرگە، کە پاسەوانیی ئەو دەکات. بە هەموو شێوەیەك سەردانی قەدەخەبوو. هیچکام لە خزمانی ئەو، تەنانەت دایك و خوشکەکەی نازانن، کە ئەو لە کوێیە. دایکی دێوانەئاسا لە گشت دەرگەیەك دەدا و لە گشت لایەك هەواڵی کوڕەکەی دەپرسێت. کەس هیچ لەبارەیەوە نازانێت. دوو مانگ بەسەر گرتنەکەیدا تێپەڕیوە، کە دواجار یەکێك لە خزمەکانیان شوێنەکەی بە سامیە'ی خوشکی دەڵێت. سامیە، دەچێتە ئانکارا و پاش تکا و پارانەوەیەکی زۆر دەتوانێت چەند خولەکێك لەتەك نازم لە زینداندا قسەبکات، ئەوەش بە ئامادەبوونی سەرۆکی زیندانی سەربازیی، نازم دەڵێت "پارێزەرەکەم ئاگاداربکەرەوە. لێرۆکانە نە کەسێك قسەی لەتەك کردووم و نە مۆڵەتیانداوە قسەبکەم. چەند مانگە لەم زیندانەدا بەبێ بەڵگە زیندانیم ... "

لەم کاتەدا لەناکاو هەواڵ دەگات، کە ژمارەیەك لە خوێندکارانی زانکۆی ئەفسەریی گیراون ... بەقسەی خۆیان "پیلان"ێکی گەوریان دەرخستووە : "پیلانی یاخیبوون" لە هێزە چەکدارەکاندا بەسەرپەرشتی نازم حیکمەت ...

ڕەشبگیر دەستپێدەکات. نازم هەروا لە زیندانی چوار میتر چوارگۆشەیی کۆنکرێتدا دێت و دەچێت. دەرچوون لەو چوار میتر چوار گۆشەیە، شەش مانگ دەخایێنێت.

خوێندکارانی زانکۆی ئەفسەریی چەند ڕۆژ لەژێر فشار و ئەشکەنجەدا لێکۆڵیام لەیەکدا دەکرێت و پاش ئەوەی کە پەروەندەیان تەواودەکەن، لەتەك نازم حیکمەت'دا دەیاندەنە دادگەی سەربازیی.
نازم بە شێوەیەکی بێچەندوچوون بە ئازادبوونی خۆی لەم دادگەدا هیوادارە. لە نامەیەکدا کە بۆ دایکی دەنێرێت ئەم بابەتە دەردەبڕێت:
**" دادگەییکردنی من بەردەوامە. لە سەدا سەد دڵنیام، کە ئازاددەبم. لایەنی زۆر مانگێکی دیکە پێکەوە دەبین... "**

بەڵگەکانی دادگەی سەربازیی بریتین لە مشتێك ئەگەری وەك " بۆی هەبوو "، " لەوانەیە " ، "ئەگەر بەم جۆرە بووایە " و شتی لەم جۆرەی دیکە.

لەو هەژمارە خوێندکارانەی زانکۆی ئەفسەریی، نازم حیکمەت تەنیا جارێك یەك کەسیانی دیتووە و ئەوانی دیکە بەهیچ شێوەیەك ناناسێت. نازم لە دادگە دەڵێت "من یەکەمین جارە کە ئەم لاوانە دەبینم" ئەو خوێندارەش تەنیا جارێك هاتۆتە دیداری نازم و بەسەر هۆنراوە و پەرتووکەکانیدا هەڵداوە و گوتویەتی کە حەزدەکات ئەو لە نزیکەوە ببینێت و لەتەکیدا ئاشنابێت. هەروەها لە کۆمۆدی خوێندارەکاندا لەنێو پەرتووکەکانیاندا، چەند بەرگ پەرتووك و کۆمەڵە هۆنراوەکانی نازم دۆزراونەتەوە، لە کاتێکدا کە هیچکام لەوانە قەدەخەنەبوون و هەموو مۆڵەتی چاپ و بڵاوکردنەویان هەبووە.

بەڵگەیەکی دیکە، دانپێدانانی چەند کەس لە خوێنکارەکانە، کە ئەوانیش لە دادگە بەبێ پەردە دەڵێن کە لەژێر زۆر و فشاری لەڕادەبەدەردا پەروەندەی لێکۆڵینەوەکەیان واژۆکردووە.

مۆڵەتی داکۆکیکردن بە عیرفان ئەمین پارێزەرەکەی نازم حیکمەت نادرێت. دادگە نهێنییە و بەخێرایی کاری خۆی تەواودەکات : نازم حیکمەت، وەك تاوانباری پلەیەك بە پازدە (١٥) ساڵ زیندانی سزادەدرێت و ئەوانی دیکە دە (١٠) ساڵ و حەوت (٧) ساڵ و پێنج (٥) ساڵیان لەم دادوەرییە بەردەکەوێت.

نازم لەم بڕیارە سەیرە، کە هیچ جۆرە بەڵگەیەکی نییە، داوای پێداچوونەوە دەکات. نازم بۆ

دایکی دەنووسێت " ... گەورەترین تاوانی من ئەوەیە، کە ناوم نازم حیکمەت'ە. بەڵام من شانازی بەم ناوەوە دەکەم و تا سەرەمەرگیش بە شانازی و ورەوە ئەم ناوەم دەمێنێت ... ئیدی چارمنییە، بێجگە لەوەی کە بە خۆڕاگرییەکی گەورەوە ئەم ساڵانە، یەك لەدوای یەك پڕیکەمەوە و بەسەربەرم... ئەگەر لەتوانادا هەبێت تۆ و پیرایە بێنە دیدارم، زۆر دڵخۆش دەبم."

لەو سەرکوتە بێوێنەیەی ١٩٣٨دا، دادگەی باڵای پێداچوونەوەش ئەم بڕیارەی، کە نە لە چوارچێوەی ماف، نە لۆجیك و ویژدان و نە لەتەك هیچکام لە ڕێسا باوەکانی کۆمەڵگەی مرۆیدا ناگونجێت، پەسەندکرد ... لە گشتی خەمناکتر ئەوەیە، کە نە ئەندامێکی ئەنجومەن، نە ڕۆژنامەنووسێك ... هیچ کەس دژی ئەم ستەمەی، کە بەرهەمی یەکێك لە ڕەشترین و تاریکترین سەردەمەکانی مێژووی تورکیە بوو، نارەزایەتی دەرنەبڕی.

بەو جۆرە نازم حیکمەت'یان لە زیندانی ڕاگرتنی سەربازییەوە بردە زیندانی ئانکارا و لەوێشەوە گواستیانەوە بۆ زیندانی سوڵتان ئەحمەد'ی ئێستانبول ...

بەڵام، وەك بڵێی ئەم پانزە ساڵ زیندانە، دوژمنانی نازم حیکمەت'ی ڕازینەکردبوو و ئالۆشی ئازاردەرانەیان دانەمرکابووەوە. پازدە ساڵ زیندان بۆ ئەم هۆنەرە ئازادیخوازە، لە ڕوانگەی ئەوانەوە سزایەکی بەسنەبوو ... بەو بۆنەوە پیلانێکی دیکە لەئارادا بوو.

جەلیلە خاتوون، دایکی نازم حیکمەت بۆ دیداری کوڕەکەی چووە زیندانی سوڵتان ئەحمەدی ئێستانبول. بەڵام نازم حیکمەت لەوێ نەبوو، گوتیان ئەویان لەوێندەرێ بردووە. بۆ کوێ؟ کەس نازانێت.

بەڕێوەبەری زیندان بە دایکی گریاو و پەریشانی نازم'ی گوت "لەلایەن هێزی دەریاییەوە هاتن و بردیان. فەرمان سەرووتریان پێبوو. ئاوای بۆ دەچم، کە دەبێت لە دادگەیەکی دیکەدا دادگەیی بکرێت."

دایکی نازم لەتەك کچەکەی لە ڕێگەی ئاشناییەکی کۆنەوە بە دەریاسالار شوکری لوکان فەرماندەی هێزی دەریایی ناسێنران و سەرەنجام بە فەرمانی ئەو پاش بەدواچوونێکی زۆر، چوونە شوێنێکەوە و لە کەشتی جەنگیی ئەرکین'دا توانیان نازم ببینن، بۆ سبەینێی ئەو ڕۆژە پیرایە'شیان لەتەك خۆیان برد. هەڵسوکەوتی کەسەکان و سەربازەکان لەتەك ئەوان بەڕێزەوە بوو و بۆ دیدار هیچ جۆرە پشێوییەکیان دروستنەدەکرد، تا ئەو ڕادەیەی کە هەمووان هیواداربوون، گرفتێك لەئارادا نەبێت.

بەڵام بەپەلە دادگەیەکی تازە بۆ نازم حیکمەت ڕێکخرابوو. ئەم جارە چەند کەس دەریاوان و پلەدار و هەروا کەسانی ناسەربازیی، کە لەنێویاندا کەمال تاهیر نووسەری بەناوبانگیش دەبینرا، گیرابوون. ئەم جارەش لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوە لەتەك کەسانی هێزی دەریایی پەروەندەیەك ڕێکخرا، کە دووبارە لەوێشدا نازم حیکمەت تاوانباری پلەیەك بوو و بەهاندانی کەسانی هێزی دەریایی بۆ هەڵچوون و یاخیبوون لە دژی دەوڵەتی نێوەندی تاوانبارکرابوو.

هەوا گەرم بوو. نازم حیکمەت لە توالێتی کەشتیدا زیندانی کرابوو. بێجگە لەو، نزیکەی سی (٣٠) تا چل (٤٠) کەسی دیکە لە هەمان کەشتیدا گیرابوون و هیچ کەسێکیان لە لەوێبوونی ئەوانی دیکە ئاگادارنەبوو. جیا جیا لێکۆڵینەوەیان لەتەکدا دەکرا و پەروەندەکان ئامادەدەکران. تاوانی هەندێك لەمانە خوێندنەوەی پەرتووکەکانی نازم حیکمەت بوو. یەك دوو کەسیان لەتەك ئەودا ئاشنابوون. هەر ئەوەندە و بەس !

بەزوویی لە هەمان کەشتیدا دادگە پێکهات؛ ئەم جارەش نهێنی ! نە پارێزەرێك، نە داکۆکییەك و نە هیچی دیکە! تەنیا ئەوە نەبێت، کە دادگە بەخێرایی کۆتاییهات و بڕیاری دادگە لە ٢٩ی ئۆگوستی ١٩٣٨دا دەرچوو : نازم حیکمەت بیست (٢٠) ساڵ زیندان، کەمال تاهیر پازدە (١٥) ساڵ و ئەوانی دیکە هەژدە (١٨) ساڵ و شانزە (١٦) ساڵ و پازدە (١٥) ساڵ و پێنج (٥) ساڵ و بەو جۆرە ...تد

ئەم بیست (٢٠) ساڵەیان لەتەك پازدە (١٥) ساڵەکەی دادگەیی پێشوو کۆکردەوە و بوو بە سی و پێنج (٣٥) ساڵ، لە باری سوککردنی یاسایی سوودیانوەرگرت و ئەنجامێك کە دەسگیربوو (٢٨) ساڵ و چوار (٤) مانگ و بیست (٢٠) ڕۆژ بوو ! بڕیارەکە بڕایەوە. نازم لەو

کاتەدا تەمەنی سی و حەفت (٣٧) ساڵ بوو. ئەگەر بیتوانیایە ٢٨ ساڵ لە سیاچاڵەکانی زیندانی شێدار و دیوار کونکرێتیدا بە نەخۆشی سنگ و (سیاتالجی Sciatalgia)، کە هەیبوو زیندوو بمێنێتەوە، ئەوا لە شەست و پێنج (٦٥)ساڵیدا ئازاددەبوو! نازم بەرانبەر ئەم بڕیارەش ناڕەزایەتی دەربڕی. خوازیاری پێداچوونەوەی بوو. بەڵام بێسوود بوو ... هیچ سەرەنجامێکی بەدەستنەهێنا. ئیدی تەنیا کارێك کە دەیتوانی بیکات، ئەوەبوو لەنێوان چوار دیواری زینداندا سەرگەرمی کاری ئەدەبی بێت و درێژە بەنووسین و هۆنراوە هۆنینەوە بدات. هەروەها بۆ ئەوەی خەرجی خۆی دەربێنێت، لەنێو زینداندا کاربکات.

دووساڵ تێپەڕی. ئاگری جەنگی جیهانی دووەم دونیای گرتبووەوە. لە زستانی ١٩٤٠دا بڕیاردرا، سزادراوە ڕامیارییەکان بنێرنە ئاناتۆڵی. نازم حیکمەت بۆ زیندانی چانکری گوازرایەوە: ناوچەیەکی دابڕاو و دووردەست لە ئاناتۆڵی ... نازم نووسینی (ئەفسانەی ئەناتۆڵی) لێرۆکانە دەستپێکرد. دواتریش شانۆیی (ڕێبوار)ی نووسی ...

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئازاری کەمەر و لاقی نازم حیکمەت زیاتردەبوو و بەرەبەرە بوو بە ئەشکەنجەیەکی لەتوانابەدەر. دکتۆران بینیان و لە ڕاپۆرتی پزیشکیاندا پێشنیارانکرد، کە باشترە بگوازرێتەوە بۆ زیندانی شارێك کە (گەڕاو- ئاوی مەعدەنی)ی تێدا هەبێت. سەرەنجام بەهۆی نەخۆشبوونییەوە ناردیانە زیندانی بورسە.

نازم حیکمەت لە زیندانی بورسە لەتەك لاوێك بەناوی ئورهان ڕاشد ئاشنابوو، کە زیندانی ڕامیاریی بوو و دوو ساڵ لەوەوپێش بە پێنج ساڵ زیندانی سزایاندابوو.

ئەم لاوە هۆنراوەی دەهۆنییەوە و لە لایەنگرانی دوور و نزیکی نازم حیکمەت بوو. ئورهان ڕاشد چەند ساڵ پاشتر بەنازناوی ئورهان کەمال'وە بووە یەکێك لە بەناوبانگترین نووسەرانی تورك و ڕۆمان و کۆمەڵە چیرۆکەکانی ئەو ئەدەبی هاوچەرخی تورکیان دەوڵەمەندکرد. ئورهان کەمال پەرتووکێکی بەناوی (سێ ساڵ و نیو لەتەك نازم حیکمەت) نووسی، کە سەرگوزشتەی ژیانی ئەوان بوو لە زیندانی بورسە'دا. سەرەڕای ئەوە بیرەوەرییەکانی ڕۆژانەی کە لەو سەردەمەدا نووسیبوونی، لەبەرگرتنەوە و نیشاندەری شێوازی ژیان و خوڕەوشت و

ڕەفتار و شێوەکاری نازم حیکمەت'ن. دەقی بنەڕەتی ئەم یاداوەرییانە ونبووە، بەڵام بەشێکیان نازم حیکمەت لە نامەکانیدا بۆ هاوسەری پیرایە لە زیندانەوە نووسیونی:

"١٩٤٢/٠٥/٢٤ بەیانییە، نازم حیکمەت سندوقێك، کە لە کارگەی دارتاشی دروستیکردووە، نیشانی ئێمەی دەدات و شانازی پێوەدەکات. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو ئەوەیە، لەبارەی کارگەلێکەوە، کە بەڕاستی تیایاندا وەستایە، هیچ خۆی هەڵناکێشێت. بەڵام لەو کارانەدا کە تازەکار و ناشییە هەر مەپرسە. بۆ نموونە ئاوا دەردەخات، کە لە هۆنەرییدا هێشتا زۆر لە سەرەتادایە و گەورەترین ئارەزووی ژیانی ئەوەیە، کە ڕۆژێك بتوانێ ببێتە هۆنەر و ئەدیبێکی چاك. بەڵام لەلایەکی دیکەوە پێیوایە، کە دارتاشێکی شارەزا و بێهاوتایە و بەڵگەشی ئەو سندوقە ئاساییەیە."

نازم حیکمەت لەنێو زیندانی بورسە درێژەی بە کاری ئەدەبی خۆیدا. هۆنراوەی دەهۆنییەوە و شانۆیی دەنووسی و هەروا کاری وەرگێڕانیشی دەکرد. لەپاڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەی کە خەرجی ژیانی دەربهێنێت و پێویستی بە هیچ کەس نەبێت، لە زیندان خەریکی کاری چنین بوو.

بەو شێوەی کە دەزانین نازم حیکمەت لە هەژدەساڵیدا تووشی نەخۆشی (ڕەبۆ/ ئاسما) بووە و سییەکانی لەو کاتەوە لاواز بووبوون و لەبەرئەوەش لە خزمەتکردنی سەربازیی لە هێزی دەریاییدا لیێبورابوون. سەرەڕای چارەسەری فرە تاکو کۆتایی تەمەنی، ئازار و فشاری سییەکانی لەکۆڵنەبوونەوە و دواتریش نەخۆشی سیاتالجی Sciatalgia و دواجار پشێوی دڵیشی بۆ زیادبوو.

نەخۆشی ڕۆیماتیزم و سیاتالجی Sciatalgia و ئازارە سەختەکانی بوونە هۆی ئەوەی کە سەرئەنجام لێپرسراوان بینێرنە زیندانی بورسە، تاوەکو مانگانە لە ڕۆژانێکی دیاریکراودا سوود لە ئاوە کانزاییەکان (مەعدەنییەکانی) ئەوێندەرێ وەربگرێت. لەم ڕۆژانەدا نازم لە زیندانەوە دەبرایە شوێنی چارەسەر لە نزیك گەرماوەکان (ئاوە کانزاییەکان) و لەوێندەرێ مۆڵەتی هەبوو، لەکاتی چارەسەرکردندا چاوی بە خێزانەکەشی بکەوێت. هاوسەرەکەی پیرایە'ش بۆ دیدەنی دەهاتە ئەوێندەرێ.

نازم حیکمەت سەرەڕای ئەم نەخۆشیانە و سەرەڕای ئەو ستەمە لەڕادەبەدەرەی، کە لە ئەو کرابوو و سەرەڕای سزادانی بە بیست و هەشت (٢٨) ساڵ زیندانی، هەرگیز خۆی نەدۆڕاند. ئەو هەرگیز لەدەست نەخۆشی و ئازارە جەستەییەکانی سکاڵای نەدەکرد و دڵخۆشی دایك و خوشك و هاوسەرەکەشی دەدایەوە. ساتێك لە کاری ئەدەبی بەتایبەت هۆنراوەهۆنینەوە نەکەوت و لە زیندانیشدا خولەکێك وچانی نەبوو. لەتەك گشت زیندانییەکان هاوەڵ بوو و هەمووان ئەویان بە " بابە " بانگدەکرد و تاڕادەی پەرستن خۆشیاندەویست.

دواجار نازم توانی چەند دەزگەی چنین ئامادەبکات و لە زیندانندا کارگەی چنینی بەڕێخست و بە پەیگیرییەکی تەواوەوە هەر ڕۆژ خەریکی کاری چنین دەبوو و چەند کەس لە زیندانیانیش لەتەك ئەودا کاریاندەکرد و قوماشی دەزوویی و خاولییان دەچنی و دەیاننناردنە دەرەوەی زیندان و دەستچنەکانیان باش دەفرۆشران. تا ئەو کاتەی کە ئیدی لێپرسراوانی زیندان دەزوو و پێداویستیان بە ئەو نەدا و کارگەی ڕستن و چنینەکەی لەکارکەوت.

سەردەمی جەنگ بوو. جەنگی جیهانی دووەم لەتەك ئەوەی کە تورکیە تێوەنەگلابوو، بەڵام نەبوونی و بێکاری و هەژاری خەڵکی ئەم وڵاتەی زیاتر و لە توانابەدەرتر دەبوو.

نازم حیکمەت لە درێژە هۆنراوەیەکی خۆیدا بەناوی (دیمەنە مرۆییەکانی وڵاتی من) ئەو مرۆڤانەی کە گەردەلوولی ڕووداوەکان لەتەك خۆی هەڵپێچیکردبوون و لەتەك خۆی بەگشت لایەکدا ڕاکێشیکردبوون، ئەو مرۆڤانەی کە تەمەنێك لەتەك ئەو هەژاری و نەداری و بێخانەولانەییەدا دەست و پەنجەیان نەرمدەرکرد، وێناندووە.

* * *

ساڵ لە پاش ساڵ تێدەپەڕێ. کۆتایی بە جەنگی جیهانی دووەم هاتووە. دونیا خەریکە هەناسەیەکی بەبەردادێتەوە. فاشیزم لە گشت لایەکەوە پاشەکشێی پێکراوە، ڕایشی سێیەم [دەوڵەتی نازیی ئاڵمانیا] کە پاگەندەی دەوڵەتی هەزار ساڵەیی دەکرد، لە چەند ساڵ زیاتر خۆی ڕانەگرت. خەڵکی وڵاتانی ژێردەستە یەك لە دوای یەك بۆ ئازادی و سەربەخۆیی دەجەنگن ... لە تورکیە'ش پاش ساڵانێکی دورودرێژ سەرکوت و داپلۆساندن بەرەبەرە سروەی ئازادی هەڵدەکا ... لە تەواوی ئەم ساڵانەدا ناوی نازم حیکمەت لە هیچ شوێنێك نەبراوە و دوژمنانی ئەو ئاوا بیردەکەنەوە، کە ئەو لەبیرکراوە و شورەکانی زیندانەکان بۆ هەمیشە ئەویان لە جەماوەرەکەی دابڕیوە، بەڵام ...

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٩دا موحەمەد عەلی سەبۆك پارێزەر، یەکەمین گوتارێکی تەکاندەری لە (ڕۆژنامەی نیشتمان)دا دەنووسێت و دادگەییکردن و سزادانی نازم حیکمەت لە ڕوانگەی یاسا باوەکانەوە هەڵدەسەنگێنێت و دەپرسێت " لەم دادگەیەدا بەپشتبەستن بە چ شتێك، بەگوێرەی کامە بەڵگە و بڕوانامە و هەروەها لەسەر بنەمای چ تاوانێك ئەو (نازم حیکمەت)یان بە ٢٨ ساڵ زیندان سزاداوە؟..."

هەر ئەم پارێزەرە لە گوتارێکی دیکەدا بەناونیشانی (درێفوس **Dreyfus** _ نازم حیکمەت ) ئەو دوو دادگەییکردنە لەتەك یەك بەراوردەکات و بە ئەفسوسێکی زۆرەوە وەبیردێنێتەوە، کە لە ماوەی چوار ساڵدا کە درێفوس ( ئەفسەری فەرەنسی کە بە تۆمەتی دژەخونیکردن لە نیشتمان گیرابوو و بە زیندانی هەتایی سزادرابوو) لە زینداندا بوو، گشت ئازادیخوازان و دادپەوەران و ڕۆشنبیران؛ بەکورتی گشت مرۆڤە ئازادیخوازەکان دژی ستەمێك، کە لەو کرابوو، دەنگی ناڕەزایەتییان هەڵبڕی و نووسەری وەك ئێمیل زۆلا بەهەموو توانا و وزەیەوە لەم ڕێیەدا تێکۆشا.

" بەڵام لە ساڵی ١٩٣٨ بەملاوە، هۆنەرێکی ئازادیخوازی وەك نازم حیکمەت، کە بەرهەمەکانی مایەی شانازی ئەدەبی هاوچەرخی تورکن، بەناڕەوا و بەبێ بچووکترین تاوان بە بیست و هەشت ساڵ زیندان لەتەك کاری سەخت سزادراوە، هیچ کەس بچووکترین هۆگریی لەمەڕ ڕۆشنبوونەوەی ئەم پیلانە شومە دژی وەها مرۆڤێك نیشاننەداوە. لە کاتێکدا کە هەمووان دەزانن و ڕاپۆرتە جۆراوجۆرە پزیشکییەکان سەلماندوویانە، کە سییەکانی لە بارێکی ناجۆردان

و خودی ئەویش زۆر لاواز و نەخۆشە و تووشی سیاتالجی Sciatalgia بووە و بەدرێژای ئەم ساڵانە لە زیندانی بورسە'دا، نەخۆشییەکانی، نەخۆشی دڵیشیان بۆ زیادبووە ... لەتەك گشت ئەمانەدا لە ماوەی ئەم دوازدە ساڵەدا، هیچ یەك لە لێپرسراوان دەستی یارمەتیان بۆ درێژنەکردووە."

لەلایەکی دیکەشەوە لە ساڵی ١٩٤٦ بەدواوە، هۆنراوەکانی نازم حیکمەت بەشێوەی جۆراوجۆر لە زیندانی بۆرسە'وە دەردەچوون و پاش وەرگێڕانیان، لە چاپکراوەکانی فەرەنسەدا بڵاودەبوونەوە. لەو کاتەدا هێشتا هیچ یەك لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی تورکیە نەیاندەوێرا ناوی ئەو بهێنن، چ بگاتە ئەوەی هۆنراوەکانی بۆ بڵاوبکەنەوە ... هۆنراوەکانی ئەو لە فەرەنسە وەردەگێڕدرانە سەر زمانەکانی دیکە و لە ئامریکا و سۆڤیەت و وڵاتانی ئامریکای لاتین چاپدەکران. تەنیا یەك دوو گۆڤار لە تورکیە تاك و تەرا چەند هۆنراوەی کورتکراوەی ئەویان بە پارێز و بەنازناوەوە چاپدەکرد.

هۆنراوەکانی نازم، بەرە بەرە لە دونیادا هەرایەکی زۆریان بەرپاکرد و ئەوەی کە وەها هۆنەرێکی گەورە، ساڵەهایە لە گۆشەی زینداندا ماوەتەوە و بەبێ بچووکترین تاوانێك سزای مەرگی شینەیی بەسەردابڕاوە، ئازادیخوازان و ڕۆشنبیرانی جیهان دەنگی ناڕەزایەتییان هەڵبڕی ... لە پاریس کۆمیتەی ڕزگارکردنی نازم حیکمەت پێکهات. ئەم کۆمیتەیە لە بەیاننامەیەکدا کە بۆ ئازادکردنی نازم حیکمەت بڵاویکردەوە، گشت ئازادیخوازان و نووسەران، هونەرمەندان و ڕۆشنبیرانی بۆ پشتیوانیکردن لە داخوازی ئازادبوونی نازم حیکمەت، بانگەوازکرد.

شانبەشانی گەورە نووسەرانی وەك پابلۆ نێرودا Pablo Neruda، ژان پوڵ سارتەر Jean-Paul Sartre، پابلۆ پیکاسۆ Pablo Ruiz y Picasso، بیرتۆڵد برێشت Bertold Brecht، نووسەران و نیگارکێشان و موزیکژەنان و زانیارانی بەناوبانگی دونیا ناڕەزایەتی توندی خۆیان بەرانبەر دەوڵەتی تورکیە دەربڕی و خوازیاری ئازادبوونی نازم حیکمەت بوون.

ڕێکخراوی یونسکۆ، ئەنجومەنی مافناسانی دیموکراتی دونیا و گشت ئۆرگان و ڕێکخراوە جیهانییەکان بەیاننامەیان بڵاوکردەوە و تیایاندا لە دژی ئەو ستەمە گەورەیەی، کە دەوڵەتی تورکیە بەم هۆنەرە ئازادیخوازەی ڕەوابینیوە، ناڕەزایەتییان دەربڕی.

ئەم دەنگهەڵبرین و ناڕەزایەتییانە بەرە بەرە لە تورکیەش پەرەیانگرت و سەرەنجام زانستگە و کۆلێج و دواناوەندیی شارەکان دەستیاندایە ناڕەزایەتی و کۆمیتەی ڕزگارکردنی نازم حیکمەت'یان پێکهێنا. پۆستەر و پلاکارت چاپکران و بەسەر دیواری شارەکاندا بەتایبەت ئانکارا و ئێستانبول چەسپێندران. لە گشت لایەکی جیهانەوە ئەم بانگەوازە دەچڕرا " نازم حیکمەت، ئازاد بکەن ! "

لێپرسراوانی تورکیە لە وەڵام بە ئەو گشتە بانگەواز و ناڕەزایەتییانە، ئەم ڕۆژ و بەیانییاندەکرد. ئەوان تەواوی هەستیان لای هەڵبژاردن بوو، بەڵام هاوار و هەرای داخوازی ئازادکردنی نازم حیکمەت، تەنانەت گاڵەگاڵی هەڵبژاردنیشی خستبووە کارایی خۆی.

لەو دوازدە ساڵەدا، کە نازم حیکمەت لە زینداندا بوو، ناوبەناو پاگەندە لەبارەی لێبوردنی گشتییەوە دەکەوتە بەرگوێی زیندانیان، بەڵام هەمیشە پاش ماوەیەکی کورت خۆشخەیاڵیی ئەو مرۆڤە بەندکراوانە، بە نائومێدی کۆتاییدەهات.

تا ئەوەی کە ساڵی ١٩٥٠ هاتەپێشەوە. لەم ساڵەدا خەڵکی تورکیە خۆی بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی پارلەمانیی ئامادەدەکرد. لە ساڵانی پاش جەنگی جیهانی دووەمەوە، سیستمی تاکپارتیی لە تورکیە هەڵوەشێنرایەوە و پارتێکی تازە بەناوی پارتی دیموکرات هاتە ئاراوە. دامەزراندنی پارتی دیموکرات، لە سەرەتادا زۆرێك لە ئازادیخوازان و ڕۆشنبیران و بەشێوەیەکی گشتی کەسانێك، کە لە سەرکوت و بیروکراتیی سەردەمدارانی پارتی کۆماری گەل گەیشتبووە گیانیان، هیوادارکرد و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لایەنگرانی ئەم پارتە تازەیە، کە دامەزرێنەرانی بە گەرموگوڕیی لە بارەی ئازادییە کەسییەکانەوە بەتایبەت "ئازادی نووسین" و " ئازادی ڕادەربڕین" دەدوان، ڕوو لە زیادبوون بوو. بەتایبەت کە پارتی تازە، بەڵێنی "لێبوردنی گشتی" ڕاستەقینەی بە جەماوەر دەدا و لەسەر ئەوە پێیدادەگرت، کە ئەم لێبوردنە زیندانیانی "ڕامیاریی"ش دەگرێتەوە. هەڵبژاردن نزیکبوو و ئەم پرسە بۆ هەردوو پارتییەکە بابەتێکی چارەنووسساز دەژمێردرا. چاپکراوەکان بە بەردەوامی لە بارەی "لێبوردنی گشتی" و ئەوانەی کە دەیانگرێتەوە، زیادەیان پێوەدەنا. لەم ماوەدا بڵاوبووەوە، کە پێشنیاری لێبوردنی گشتی لە ئەنجومەندا، لە هەڵسەگاندندایە و شتێکی ئاوها تا پەسەندکردنی نەماوە. ئەم هەواڵە لە تەواوی زیندانەکانی تورکیە، لەوانەش زیندانی بورسە'دا بڵاوبووەوە و زیندانیانی

دڵخۆش و هیوادارکرد. نازم حیکمەت'یش ئەم هەواڵەی بیست، بەڵام ئەویش وەك زیندانییە ڕامیارییەکانی دیکە لەم قسانە بیزار بووبوو و لەبەرئەوە ئەوەندە بۆی سەرجڕاکێشنەبوو. تا ئەوەی کە ڕۆژێك منەوەر بۆ سەردانیکردنی هاتە زیندان.

لەم ڕۆژانەدا پەیوەندی نازم و هاوسەرەکەی پیرایە ساردوسڕ بوو، کە لە ئەنجامی ئەوەدا لەیەك جیابوونەوە. بەسەرهاتی ئەڤینی منەوەر و نازم بۆ بیست ساڵ پێشتر دەگەڕایەوە. ساڵی ١٩٣٠ منەوەر خاڵۆزای [کچەخاڵی] نازم، کە دایکی خەڵکی فەرەنسە بوو، هەڤدە ساڵە بوو و تازە لە فەرەنسە گەڕابووەوە. پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان ئەو و نازم 'دا پەیدابوو و منەوەر ئارەزووی خۆی بۆ هاوسەریکردن لەتەك نازم دەبڕی. نازم لە وەڵامدا پێیگوتبوو "تۆ هێشتاکە زۆر لاوی، دەبێت خێزان پێکەوەبنێی و ماڵ و ژیان و مناڵت هەبێت، من ناتوانم ئەم شتانە بۆ تۆ بهێنمەدی. من لە داهاتوودا، چاودێرییکران و ڕاونان و زیندان و دوورخستنەوەم لەپێشە. من بۆ ژیانی ئاسوودە و خێزان دروستنەکراوم. " لەو شەوە هاوینەی ١٩٣٠دا، لە کاتێکدا کە پێشنیاری کیژۆڵەیەکی هەڤدە ساڵەی ڕەتدەکردەوە، کێ دەیتوانی پێشبینی ئەوە بکات، کە بیست ساڵ دواتر، هەر ئەو ژنە دەبێتە دایکی تاقە کوڕەکەی نازم حیکمەت؟

منەوەر ئانداچ ساڵی ١٩٦٧ لە دیمانەیەکدا لەتەك رادی فیش نووسەری ڕوس و هاوەڵی نازم حیکمەت، کە پاش مردنی نازم پەرتووکێکی لەبارەیەوە نووسی، ئاوای گوت:
" لەو کاتەدا هەستمدەکرد، کە بە توندی سووکایەتیم پێکراوە. چۆن دەبوو؟ چۆن دەلوا، کە ئەو ئەڤینی من ڕەتبکاتەوە؟ بۆ ئەوەی کە نازم لەبیری خۆم دەرهاوێم، هەرچیم لەدەستهات، کردم. هاوسەرییمکرد و بوومە خاوەنی کیژێك. بەڵام... "

هێشتاکە منەوەر، کە هاوسەری یەکەمی زۆری نەخایاندبوو و بە جیابوونەوە کۆتاییهاتبوو، هاتە دیدەنی نازم. پێیگوت کە بڕیاری خۆی داوە و ئیدی هەرگیز لە ئەو دانابڕێ و ئەم بڕیارە لەسەر بنەمای هەست و سۆز نییە، بەڵکو لە ڕووی ژیریی و هۆش و لۆجیکەوە دراوە. هەروەها گوتی دەزانێت کە ناهێڵن ژیانێکی ئاسایی و ئاسوودەی هەبێت و دەشزانێت کە ئەو چ دژواریی و گیروگرفتێکی لەپێشە، بەڵام بەو گشتە دژوارییانە ڕازییە و بەگیانی دەیانسێنێت .... نازم و منەوەر هاوسەریانکرد. ئەمە چوارەمین هاوسەری نازم حیکمەت بوو. نازم هەروا لە

زیندانی بورسە'دا بوو و منەوەریش لەو شارەدا نیشتەجێبوو و چاوڕێی ئازادبوونی هاوسەرەکەی بوو...

ئەو ڕۆژە منەوەر هاتە زیندان. بڕێکی زۆر ڕۆژنامە و گۆڤار و هەواڵی هیوابەخشی لەتەك خۆی هێنابوو. باوەڕی بە نازم هێنا، کە خەریکە خەونی لێبوردنی گشتی دەبێتە ڕاستی. ئەو گۆڤارێکیشی بەناوی نازم حیکمەت بۆ هێنابوو. ئەم گۆڤارە لاوانی ئێستانبول بڵاویاندەکردەوە و ڕوو لە ئەو [نازم] نووسیبوویان :
" تۆ فێرتکردین، کە چۆن مرۆڤەکانمان خۆشبوێن، ئێمەش ئێستاکە بۆ ئازادبوونی تۆ خەریکن دەجەنگین ... " بەخوێندنەوەی ئەم پەیامە، ئەشك زایە چاوەکانی نازم ...

نازم حیکمەت'یش وەك گشت زیندانییە ڕامیاریەکانی دیکە دڵبەندی ئەم هیوایە بوو، کە بەزوویی یاسای لێبوردنی گشتی لە ئەنجومەندا پەسەنددەکرێت، لە نامەکانی خۆیدا مژدەی بە دایك و هاوەڵانی دەدا، کە ئیدی سەردەمی لێکدابڕان و ئازار کۆتاییدێت و ڕۆژی ئازادبوون زۆر دوور نییە. بەڵام لەم ڕۆژانەدا، لە ناکاو هەواڵێکی نائومێدگەر لە زیندانەکانی وڵاتدا بڵاوبووەوە "ئەنجومەن بەبێ ئەوەی یاسای لێبوردنی گشتی پەسەندبکات، بۆ کاروباری هەڵبژاردن، دەستی بە پشووی خۆی کردووە ! "

ئەم لێدانە، لێدانێکی کوشندەبوو ... لە گشت زیندانەکاندا باری یاخیبوون و هەڵچوون سەریهەڵدا، گشت هیواکان بێسەرەنجام بوون، ئەم جار دیوارەکانی زیندان تەنگتر و هەوای خنکێنتر و کاتەکانی بێبڕانەوەتر دەهاتنە پێشچاو ...

نازم حیکمەت بیری لێکردەوە، کە لەوە زیاتر ناتوانێت بەرگەی ئەم ستەمە بگرێت. ئەو چاك دەیزانی، کە ئازادبوونی ئەو واتە ئازادبوونی هەزاران زیندانی ڕامیاریی دیکە، کە لە زیندانە جۆراوجۆرەکانی وڵاتدا بەندکرابوون ...

هیچکام لە ناڕەزایەتییەکان، بەیاننامە، تێلەگراف و نامەگەلێك، کە لە گشت لایەکی جیهانەوە هەروەك لافاو بەڕووی سەرانی تورکیە'دا هەڵیاندەکرد، کاراییان دانەنابوو. لەتاو

ئەوە نازم حیکمەت بڕیاریدابوو، دواشتێك کە بۆی ماوەتەوە، لە ڕێی ئازادی خۆی و هەزاران زیندانیدا بیبەخشێت: واتە گیانی !

هەڵبەتە دەبێت بگوترێت "نیوەی گیانی!"، چونکە لەم دوازدە ساڵەدا سەرەڕای پشتئێشە و لاوازی سییەکانی و ئازاری سیاتالجی Sciatalgia، تووشی نەخۆشی دڵیش بووبوو. سەرەڕای گشت ئەوانەش، ئەو بڕیاریدا لە خواردن مانبگرێت : یان ئازادبوون یان مردن !

لەم سەردەمەدا، نازم حیکمەت لە زۆربەی وڵاتانی دونیادا تەواو ناسراوبوو. لە تورکیە'ش ڕۆژنامەوانان ساتێك لێی نائاگانەبوون و چاپکراوەکان هەموو ڕۆژێ هەواڵێکی تازەی ئەویان بڵاودەکردەوە.

نازم حیکمەت وێردی سەر زمانان بوو. هەمووان خوازیاری ئازادبوونی ئەو بوون. ئێستاکە ئیدی بۆی ساخ بووبووەوە، کە لە ماوەی ئەم دوازدە ساڵەدا بەرگەی چ ستەمێکی کوشندەی گرتووە.

نازم حیکمەت ڕایگەیاند، کە لە ڕۆژی ٨ی ئاپریلی١٩٥٠'وە لە خواردنماندەگرێت و نووسی کە ئەم کارەی ئەو هەرگیز لە ئەنجامی نائومێدییەوە نییە، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی مافی خۆیەتی و هەروا درێژەیداین، " گیانی تەنیا شتێکە، کە دەتوانێت بەوپەری ئارەزووەوە لەڕێی خۆی و کەسانی دیکەدا بیبەخشێت ...".

بابەتی لەخواردنمانگرتنی نازم لە چاپکراوەکاندا بڵاوکرایەوە و گشت لایەنگرانی ئەوی پەشێوکرد و ڕای گشتی دونیای وروژاند. جارێکی دیکە لافاوی تیلەگراف و نامەی نارەزایەتی بەرەو سەرانی دەوڵەتی تورکیە لە هەر چوارلای دونیاوە هەڵیکرد. لەلایەکی دیکەیشەوە لایەنگرانی نازم و هەر ئاواش لێپرسراوان بەشێوەیەك دەیانویست بەر بە مانگرتن لە خواردنی ئەو بگرن. لایەنگرانی نازم، پەشێوی گیانی ئەو بوون و دەیانزانی کە ئەو نەخۆشە و توانای بەرگەگرتنی ئەو کارەی نییە. سەرانی وڵاتیش دەیانویست بەر بە وروژانی خەڵك بگرن.

بەشێوازی جۆراوجۆر ویستیان ئەو لە بڕیارەکەی پاشگەزبکەنەوە و جارێکی دیکەیش بەهیوایەکی بێبنەما ئەو لەپشت دیواری زیندان ڕابگرن. بەڵام نازم لەسەر بڕیاری خۆی سووربوو و لە هەمان ڕۆژدا کە پێشتر ڕایگەیاندبوو، دەستیدایە مانگرتن لە خواردن ...

لەخواردنمانگرتنی نازم نەك تەنیا بۆچوونی گشتی تورکیەی دژی کەسانێك، کە ئەم هۆنەرە ئازادیخوازە، کە بە شانازی ئەدەبی هاوچەرخی تورك و باوکی هۆنراوەی تورکی دەژمێردرا، زیندانیکردبوو، وروژاند، بەڵکو خەڵکی زۆرێك لە وڵاتانیش لەتاو ئەو هەمگە ستەم و نادادوەرییەی کە سەرانی دەوڵەتی تورکیە بەرانبەر ئەم هۆنەرە گەورەیە ڕەوایاندەبینی، تورەکرد... دەوڵەت و ڕامیارکارانی وڵات بەرەبەرە شڵەژان. شالیاری دادوەریی دەستبەجێ لێکۆڵەرەوانی ناردە زیندانی بورسە و هەوڵیاندا بە بەڵێندانی درۆینە، ئەو لە بڕیارەکەی پاشگەزبکەنەوە. بەڵام نازم گوێی بە هەوڵەکەی ئەوان نەدا. ناچار، دەوڵەت ڕایگەیاند، لەبەرئەوەی کە نازم حیکمەتی هۆنەر بەتوندی نەخۆشە و پێداویستییەکانی چارەسەرکردنی لە زیندانی بورسە'دا نین، دەیگوێزرێتەوە بۆ ئێستانبول. زیندانیانی زیندانی بورسە، کە نازم'یان زۆر خۆشدەویست و بە "بابە" بانگیاندەکرد، بەم هەواڵە پەشێوان. ئەوان نەیاندەویست، هەر ئاوا بە ئاسانی "بابە" لەدەستبدەن. لە کاربەدەستانی دەوڵەتی دڵنیانەبوون و دەترسان، کە لەنێویبەرن. خەریکبوو زیندانیانی بورسە هەڵچن. لەبەرئەوە کاربەدەستانی دەوڵەت لەژێر چاودێرییەکی زۆردا، نیوەشەو بەنهێنی نازم'یان لە زیندانی بورسە دەرکرد و گواستیانەوە بۆ ئێستانبول. لە ئێستانبول دەستبەجێ ئەویان لە نەخۆشخانە پڕ ئامێرەکان خەواند. نازم بەرهەڵستیدەکرد و ئامادەنەبوو مانگرتنەکەی بشکێنێت. دکتۆر و شارەزایان چاویانپێکەوت و ڕاپۆرتیان لەبارەیەوە نووسی، کە زۆر نەخۆشە، باری سییەکان و دڵی زۆر خراپە و بۆی هەیە گیانی لەدەستبدات. نازم دەیزانی، کە مردنی ئەو بۆ دوژمنەکانی مەترسیدارە، لەبەرئەوە هۆگری مردن بووبوو و گوێی لەو ڕاپۆرتانە شلنەبوو و بەشێوەیەکی بێچەندوچون ملی بە مانەوە و خەوتن لە نەخۆشخانە نەدەدا و ئامادەی چارەسەرکردننەبوو و داوایکرد هەرچی زووتر بیگێڕنەوە زیندان. سەرەنجام دەسەڵاتداران ناچاربوون، بیبەنە یەکێك لە زیندانەکانی ئێستانبول ...

خاتوو جەلیلە دایکی نازم حیکمەت، کە تاڕادەیەك بینایی لەدەستدابوو و لە خەمی کوڕە ئازادیخوازەکەیدا لە باری ئاسایی کەمێك پیرتر دەهاتەبەرچاو، بۆ ڕزگارکردنی کوڕەکەی کە

له یازدەهەمین ڕۆژی مانگرتنەکەیدا بێهۆشکەوتبوو و لە گیانەڵاندا بوو، لەسەر پردی بەناوبانگی  گالاتای دانیشت و ڕۆژووی ڕاگەیاند و بۆ ڕزگارکردنی نازم واژۆی کۆدەکردەوە. خەڵك لە دەوری ئەم ژنە جەرگسووتاوە، کۆبوونەوە و لەسەر پردەکە قەرەباڵخییەکی سەیر پەیدابوو. پۆلیس ئەویشیان گرت بردیانە پۆلیسخانە، بەڵام پاش چەند ساتێك (ساعەتێك) بۆ پێشگرتن بە وروژانی زیاتری خەڵك، ئازادیانکرد.

بەڵام بۆ سبەینێی ئەو ڕۆژە، ئورهان وەلی ، ئەکتای ڕەفعەت و مەلیح جەودەت، سێ هۆنەری بەناوبانگ و خۆشەویستی خەڵك، بۆ ڕزگارکردنی گیانی نازم حیکمەت سێ ڕۆژ ڕۆژوویان ڕاگەیاند ... لەم کاتەدا هەڵبژاردن دەستیپێکرد. لەبەرئەوە تا پێکهێنانی ئەنجومەنی تازە و پەسەندکردنی یاسای لێبورنی گشتی، دەبوو چاوەڕوانبکرێت. لەسەر داخوازی پێداگرانەی زۆرێك لە نووسەران و هۆنەران و هونەرمەندان و ڕۆشنبیرانی وڵات، بەتایبەت کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر لە لایەنگرانی، نازم ئامادەبوو بەشێوەی کاتی مانگرتنەکەی بشکێنێت.

سەرەنجام هەڵبژارن کرا و پارتی دیموکرات دەسەڵاتی گرتەدەست، پاش پێکهێنانی پارلەمان، پێشنیاری لێبوردنی گشتی چووە بەردەم پارلەمان. جارێکی دیکە دوژمنانی نازم دەستەوەستان نەمانەوە و خاڵێکیان خستە یاسای لێبوردنی گشتییەوە، کە بەگوێرەی ئەوە کەسانێك، کە بەگوێرەی بەندی (٩٤)ی یاسای سزادانی سەربازیی گیرابوون، بەر لێبوردن نەکەون و ئەمە بەواتای پانزدە (١٥) ساڵی دیکە لە زینداناڕاگرتنی نازم حیکمەت، بوو. بەڵام نارەزایەتییەکان جارێکی دیکە زیاد و زیادتر پەرەیانسەند و دواجار بە ناچاریی خاڵێکی دیکەیان خستە یاساوە، کە وەبەرکەوتووانی ئەو بەندەش دوو لەسەر سێی سزاکەیان دەبەخشرا و نازم کە سیازدە ساڵی لە بیست و هەشت ساڵ زیندان بەسەربردبوو، سەرەنجام ڕۆژی ١٥ی جونی ١٩٥٠ بە دڵێکی نەخۆش و سی لاوازوە لەپشت شورەی ئاسنینی زیندان هاتەدەر. هاوسەرەکەی منەوەر، لە تەواوی ئەم ماوەدا بۆ ساتێك وچانی نەدابوو. یەك ساڵی تەواو لە شاری بورسە نیشتەجێ بووبوو و لەم گشتە ماوەدا تا ئەو جێیەی، کە دەستورەکانی زیندان بواریان دەدا، چاودێریی و ئاگاداریی هاوسەرەکەی دەکرد.

زندانیانی زیندانی بورسە، چ ئەوانەی کە لەسەر بنەمای لێبوردنی گشتی ئازاد بووبوون و چ ئەوانەی کە چەند ساڵ لەماوەی زیندانی بوونەکەیان داشکابوو، بەڵام هێشتاکە دەبوو لە

زیندان بمێننەوە، بە شادی و دڵخۆشییەکی بێوێنەوە لە دەوری نازم کۆبووبوونەوە و بەبۆنەی ئازادبوونی ئەوەوە، جەژنیان دەگێڕا.

نازم'یش وەك گشت زیندانییە ئازادبووەکان پاش چەند ڕۆژ کەوتە گەڕان لە دووی کار. دەیویست کاربکات و خەرجی خۆی و هاوسەر و کۆرپەکەیان کە بەڕێوەبوو، پەیدابکات. ئەو چەند زمانی دەزانی. لە زیندان ساڵەهای ساڵ کاری ڕستن و چنینی کردبوو و لەم کارەدا بووبووە وەستا. بەڵام ئەوانەی کە لە تەواوی ئەم ساڵانەدا نەیانهێشتبوو گەورەترین هۆنەری تورك هەناسەیەکی ئاسوودە هەڵکێشێت، جارێکی دیکە لەسەر ڕێی ئەو کۆمەلێك ڕێگریی نەدیتراو و دیتراویان دانان.

ئەو لە ڕوانگەی ئەوانەوە تاوانباربوو، ئەگەرچی بەر لێبوردنی گشتی کەوتبێت یان نا، دەبوو دەنگی ئەو کپبکرێت، چونکە هەندێك گوێچکە بەرگەی بیستنی دەنگی ئەویان نەدەگرت. نازم لەم دەرگە و لەو دەرگەی دەدا، ئامادەبوو هەر کارێك بکات، تاوەکو تەنیا بتوانێت خەرجی ژیانی خۆی و هاوسەر و منالی دابینبکات. ئیدی تەنیا ئارەزووی ئەو ئەوە بوو، کە ماڵێکی گچکە بەکرێبگرێت و بە ئارەزوو و خواستی خۆی بیڕازێنێتەوە و پاش ساڵانێك لە زیندان و دەربەدەری بە ئاسودەییەوە لە تەنیشت هاوسەر و منالەکەیدا بژی و خەریکی کاری ئەدەبی و هۆنراوە و شانۆنووسین بێت. ڕۆژانێکی دورودرێژ لە دووی کار گەڕا، بەڵام کەس ئامادەنەبوو، کار بەو بدات. لە هەمووی خراپتر، ئەوەی کە هێشتا پۆلیس لە دووی بوون، بۆ هەر شوێنێك دەڕۆیشت، چەند پۆلیسی نهێنی لە دووی بوون.

دواجار لە هەمان کۆمپانی فیلمسازیدا، کە پێش زیندانییکرانی، کاری لێ دەکرد، توانی کارێك پەیدابکات. هەرچەندە داهاتێکی کەمی هەبوو، بەڵام بەرانبەر بەم چاکەیەی بەڕێوەبەرانی کۆمپانییەکە سوپاسگوزاربوو، کە وێرابوویان کار بەو بدەن. لەو کۆمپانییەدا سیناریۆی دەنووسی، خەریکی کاری دوبلاج بوو و لە ئامادەکردنی فیلمەکاندا چاودێرییدەکرد، بەڵام بڕیاربوو بەهیچ شێوەیەك لە هیچ کوێیەکی ئەو فیلمانەدا ناوی ئەو نەبردرێت. نازم بەم مەرجە ڕازیبوو. پاشنیوەڕوان ماندوو و نیوەگیان لەکار دەگەڕاوە و لە تەنیشت هاوسەرەکی منەوەر، هیلاکی ڕۆژگاری لەبیری خۆی دەبردەوە و بۆ ساوایەك کە لە داهاتوویەکی نزیکدا لەدایکدەبوو، پلانی دادەڕێژا و جار جار هاوەڵە نزیکەکانی وەك عابدین دنیو'ی نیگارکێش،

سەعید فایق نووسەری بەناوبانگ و ئەکتای ڕەفعەت'ی هۆنەر دەهاتنە دیدەنی و چەند سات پێکەوە دادەنیشتن و لەبارەی هونەر و ئەدەب قسەوباسیاندەکرد.

سەرەنجام منەوەر، کوڕێکی بوو. نازم هەمیشە بە خزم و هاوەڵانی دەگوت : کە منەوەر کوڕێکی بۆ ئەو دەبێ و پێشتر ناویشی نابوو "مەمەت" ... سەرەنجام مەمەت لەدایکبوو. شادی نازم لەڕادەبەدەر بوو. ئەم پیاوە، ئەم مرۆڤە کە دونیای بە هۆنراوەی جوان و پایەدارییەوە داگرتبوو، بەختەوەری بەواتای کەتواریی، پاش ئەو هەمووە ڕەنج و کوێرەوەرییە بێئەژمارانە، کە لەو نێوەندە بچووکە خێزانییەی بەدەستهێنابوو. بە شادییەکی لەڕادەبەدەر و و بە شانازیی باوکانەوە لەبارەی مەمەت'وە دەدوا. مافی خۆی بوو، چل و نۆ ساڵ لە تەمەنی دەگوزەرا و تازە بووبوو بە باوك.

نازم دەیزانی کە دەیانەوێت ئەم خۆشییە گچکەیەی، کە پاش ساڵانێك لە زیندان و دەربەدەری بەدەستهێنابوو، لێیبستێنن. دەیزانی کە هەمیشە چاودێرییدەکەن، دەیزانی کە چاوەڕێی بیانوویەکی بچووکن، بەڵام ئەو هەموو توانای خۆی دەخستەگەڕ، تاوەکو بیانوویەك نەداتە دەست دوژمنانی. چونکە بەتەمابوو لە وڵاتەکەیدا لە تەنیشت خێزانەکەیدا بژی و ئیدی بە هیچ شێوەیەك ئامادەنەبوو، ئەوەی کە بەدەستهێناوە، لەدەستیبدات. بەڵام ...

ڕۆژێك کاربەدەستێکی فەرمانگەی سەربازگیریی لە دەگەی ماڵەکەی دەدا و داوا لە نازم دەکات، کە هەرچی زووتر خۆی بۆ ئەنجامدانی خزمەتی سەربازیی بناسێنێت. نازم حیکمەت باوەڕینەدەکرد، کە لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا ئەویان بۆ خزمەتی سەربازیی بیەوێت. بێجگە لەوەش، ئەو کە کۆلێجی هێزی دەریایی تەواوکردووە و ماوەیەکیش لە هێزی دەریاییدا خزمەتیکردووە. هەرچۆن بوو، سبەینێی ئەو ڕۆژە گشت بڕوانامەکانی و ڕاپۆرتە پزیشکییە جۆراوجۆرەکان لەبارەی نەخۆشی دڵ و لاوازی سییەکانی و ئازاری سیاتالجی Sciatalgia، لەتەك خۆی بردنییە فەرمانگەی سەربازگیری و چەند سات لەتەك کاربەدەستانی بیانووگیر مشتومڕدەکات، ڕۆشنیدەکاتەوە و باسیدەکات. بەڵام هەوڵەکەی بێسوودەبێت. تەنانەت شوێنی خزمەتکردنەکەشی پێشتر ئامادەکرابوو؛ لە شوێنێکی دووردەست و ئاو و هەوا ناجۆری وڵات! نازم پێشنیاردەکات، کە پزیشکی سەربازیی ببینێت. پزیشك بەوردی دەیپشکنێت و

دووبەدوو پێیدەڵێت "تۆ بەم بارەوە کە هەتە، نیو سات لەبەر خۆرەتاو بووەستیت، مردنت مسۆگەرە! بەڵام چی بکەم، کە دەبێت لە ڕاپۆرتەکەمدا بنووسم، کە تەندروستیت زۆرباشە !"

ئیدی ئەمە لە توانای ئەو بەدەربوو. بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت ئەم پیلانە پوچەڵبکرێتەوە و بەهیچ شێوەیەکیش ناتوانرێت بەرگەی بگیردرێت. لەو کاتەدا نازم ڕووداوی کوشتنی سەباحەدین عەلی بیرکەوتەوە ؛ نووسەری بەناوبانگ، کە دواجار بە فێڵ و تەڵەکە لەسەر سنووری بولگاریا لەکاتی هەڵهاتندا کوشتیان ! نازم کەوتە بیرکردنەوە : سەباحەدین عەلی'یان ئەوەندە خستە ژێر فشارەوە، تاوەکو ناچاربوو ڕابکات و سەرەنجام لەسەر سنووری تورکیە-بولگاریا بەدەستی یەکێك لە نۆکەرانیان کوشتیان و ئاوایان نیشاندا، ئەو کەسەی کە لەتەکیدا بووە، لەبەر چاوبرینە پارەوپوول، ئەوی کوشتووە .... نازم ئەمەی بەخەیاڵداهات، نەکا ئێستاکە بۆ ئەویش وەها پیلانێکیان دارشتبێت؟ تۆ بڵێی ئەم جارە ویستبێتیان بەشێوەیەك ئەو لەنێوبەرن. هەر چەند شەوێك لەوەوپێش، کە لەسەر کارەوە بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە، خەریکبوو بە ئۆتۆمۆبێل بەژێرییەوە بکەن ... ئەو ڕۆژانە هاوەڵانی دوور و نزیکی ئاگاداریاندەکردەوە و پێداگرانە داوایانلێدەکرد کە ئاگاداری خۆی بێت ... نازم هەستی بەمەترسی کردبوو ... هەردەم مەرگ بۆ ئەو لە بۆسەدا بوو ... ئەم جار دەیانویست بیبەنە سەربازی و لەو ناوچە ئاو و هەوا خراپەدا سەنگومی بکەن. ئەوان بەباشی دەیانزانی، کە ئەو نەخۆشە ! باری دڵ و سییەکانی جۆرێکە، کە لەو ناوچەدا چەند ڕۆژ زیاتر ناژی.

## لە ساڵی ١٩٥١دا لەتەك هاوەڵێكی لاودا لە دەریادا بەرەو مەرگ چووم

بیری لێكردەوە و دیتی كە ئەو چ بیەوێ و چ نەیەوێ، ڕۆژی دابڕان هاتۆتەپێشەوە و دەبێت بڕوات... هەرچی زووتریش دەبێت بڕوات و نیشتمانەكەی كە ئەوەندەی خۆشدەویست و خەڵكەكەی كە بە خاتری ئەوان دەژیا و خۆشەویستی ئەوان سەراپای داگرتبوو، بەجێبهێڵێت. هاوسەرەكەی، هاوسەری خۆشەویست و میهرەبانی، ماڵە گچكەكەی كە تازەكی بە داهاتە كەمەكەی كەل وپەلی بۆ كڕیبوو و لە گشتی زیاتر، كوڕەكەی مەمەت هیوای ژیانی بەجێبهێڵێت...

لە بەرەبەیانێكدا ماڵئاوایی لە هاوسەرەكەی منەوەر و كوڕە ساواكەی مەمەت كرد و بەرەوپیری سیازدە ساڵ تاسە و دابڕان چوو، گوتبووی كە دەچێتە ماڵی خوشكەكەی لە ئانكارا ...

چەند ساتێك دواتر كاربەدەستێكی دەزگەی ئاسایش تەلەفۆنی بۆ خوشكەكەی لە ئانكارا كرد و پرسی كە ئایا براكەی لەوێیە؟ سامیە'ی خوشكی پەشۆكا و ترسا كە بەڵایەك بەسەر براكەیدا هاتبێت، بەڵام كاربەدەستەكە پێیگوت، كە نازم سەفەری كردووە و گوتویەتی دەچێتە ئانكارا و ئیدی وەڵامی پرسیارەكانی دیكەی سامیەی نەدایەوە و گوشی تەلەفۆنەكەی دانایەوە.

نازم سەفەرێكی مەترسیداری بۆ خۆی ڕێكخستبوو، بڕیاری دابوو لە ڕۆژێكی تۆفانیدا كە كاربەدەستانی زۆر لە دەوری بوگاز (بسفر) نین، لە دەریا بدات.

نازم سەرەتا سواری كەشتییەكی كەناریی بوو و لە یەكێ لە لەنگەرگە چۆڵەكاندا دابەزی، كە بەگوێرەی ڕێكەوتنی پێشتریان، هاوەڵێكی لاو بە بەلەمێكی موتورداری ماسیگرییەوە چاوەڕێیبوو. چووە بەلەمی هاوەڵەكەیەوە. بۆ ئەوەی سەرنجی دەوروبەر ڕانەكێشن بەرەو باشوور چوون و پاش ئەوەی كە لە كەنار دووركەوتنەوە، بەلەمەكەیان بەرەو باكوور بادایەوە و بەخێرایی لە دەریای ڕەشدا تێپەڕین. ئێوارە بوو، تۆفان توندتر بوو و شەپۆلە گەورە و بەرزەكانی دەریا، بەلەمەكەیان وەك پووشێك دەهێنایە هەشەكۆ. لەم كاتەدا مۆتۆڕی بەلەمەكەش لەكاركەوت. لە كاتێكدا كە ئیدی تەمابڕ بووبوون، كەشتییەك كە لە بوگاز(بسفر)ەوە دەهات، هاتە دەریای ڕەشەوە و كاتێك كە بە تەنیشت بەلەمەكەی ئەواندا

تێدەپەڕی، لەژێر دوا ڕۆشنایی خۆردا، نازم دیتی کە کەشتییەکە، کەشتی وڵاتی ڕۆمانیا'یە. نازم ڕوو لە چەند دەریاوانێك کە لەسەر تەختی کەشتییەکە وەستابوون و بە سەرسوڕمانەوە سەیری ئەم بەلەمە گچکە و لەکارکەوتوەیان دەکرد، کە گیرۆدەی شەپۆلەکانی دەریابوو بوو، هاواریکرد "من نازم حیکمەت، هۆنەری تورکم. هەواڵ بگەیێننە کاپیتان". کەشتییەکە تێپەڕی و پاش چەند چرکە ساتێك، کە ئەوان لەنێوان گومان و مەرگ و هیوای ژیاندا دەست و پێیان ڕادەوەشاند، کەشتییەکە وەستا ... چەند چرکە ساتێك دواتر نازم و هاوەڵەکەی لە کابینەی کاپیتنی کەشتییەکەدا بوون و بەرەو یەکێتی سۆڤیەت دەڕۆیشتن.

نازم حیکمەت، هۆنەری گەورەی تورك، کە بە سەراپای گیانییەوە نیشتمانەکەی خۆی خۆشدەویست، سیازدە ساڵی دوور لە نیشتمانەکەی بردەسەر. لەم ماوەدا بۆ زۆر شوێن گەشتیکرد و لە گشت شوێنێك لەتەك شەیدایی و وروژانی لەڕادەبەدەری ئازادیخوازانی جیهان ڕووبەڕوو بوو. هۆنەران و نووسەران و هونەرمەندانی گەورە، کە لە دواساڵی زیندانبوونەکەیدا بۆ ئازادبوونی ئەو دەنگیان هەڵبڕیبوو، هۆنراوەیان هۆنیبووەوە و بەیاننامەیان دەرکردبوو، یەك بە یەك سەردانی کردن. چەند جار چووە پاریس. لە تەنیشت ئاراگۆن بۆ کارگەران هۆنراوەی خوێندەوە، لەتەك سارتەر قسەوباسگەلێکی دوورودرێژی کرد، دوابەرهەمی پیکاسۆ'ی لە شوێن کارەکەیدا دیت. ساڵی ١٩٥١ لە ڤیستیڤالی لاوان لە بیرلین لەتەك پابلۆ نیرۆدا ئاشنا بوو و هۆنراوەکانی ئەوی لە زمانی خۆیەوە بیستن. لەتەك نیکلاس گیلین هۆنەری کوبایی گەشتیکرد و لەتەك ئەودا لە هۆتێلە ئاسیایی و ئەوروپاییەکاندا خەوت. چووە کوبا و لە شەقامەکانی هاڤانا'دا لەتەك لاوانی کوباییدا لە ڕێپێوانیکرد و سروودی گوت. بەڵام ئیدی هەرگیز نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانە خۆشەویستەکەی و بەو ئارەزووەوە تلایەوە:

**نیشتمانم، نیشتمانم، نیشتمانم**

**ئیدی نە کڵاوی چنراوی تۆم بۆ ماوەتەوە**

**نە کەوشێك کە ڕێگەکانی تۆی پێوابێ**

**دوا کراسیشم سەردەمانێکە لەبەرما دڕاوە**

**کە لە کەتانی ئاسك بوو**

**ئێستا ئیدی تۆ تەنیا لە سپێتی پرچما**

**لە وەستانی دڵما**

**لە چرچ و لۆچی نێوچەوانمای**

نیشتمانم

نیشتمانم

نیشتمانم

بەرهەمەکانی نازم لەم ماوەدا بۆ زیاتر لە سی (٣٠) زمان وەرگێڕدران و چاپکران. بەڵام تا کاتێك کە زیندوو بوو، نەیانهێشت لە نیشتمانی خۆیدا بە زمانی خۆی بڵاوبکرێنەوە. دە (١٠) ساڵی تەواو لەتەك منەوەر نامەی گۆڕییەوە. ئەو نامانەی کە بە هۆنراوە بۆ منەوەر'ی نووسیبوون، دواتر کرانە پەرتووکێکی جیا.

بەڵام نازم لە دوا ساڵەکانی ژیانیشیدا، بوو بە دڵدار و لەتەك ڤراتۆلیا کوڤا کە زۆر لە خۆی لاوتر بوو، ساڵی ١٩٦١ هاوسەرییکرد.

دڵەی نەخۆشەکەی نازم حیکمەت، لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٣ی جولای ١٩٦٣دا لە مۆسکۆ لەلێدانکەوت. مردنی ئەو، خەڵکی زۆربەی وڵاتانی دونیای خەمبارکرد. زۆرێك لە هۆنەران و نووسەران لە پرسەی ئەودا بەرهەمی بەرچاویان ئافەراند، بەڵام هیچکام دەردناکتر لە هۆنراوەی هاوەڵی پابلۆ نیرۆدا'ی هۆنەری گەورەی چیلی نییە :

بۆچ مردی نازم ؟

ئێستا، چ بکەم

بەبێ هۆنینەکانی تۆ

لە کوێ چاوگێك پەیداکەم کە تێیدا

هەمان خەندە هەبێ، کە لە کاتی پێشوازی ئێمەدا لە ڕوخساری تۆدا بوو

نیگایەك وەك نیگای تۆ

تێکەڵەیەیێك لە ئاو و ئاگر

پڕ لە ئازار و شادی

نیگایەك کە ئێمەی بۆ ڕاستی دەچڕی، لە کوێ پەیداکەین ؟

برای من

وەها هەستگەلی تازە و ئەندێشانێکت لە مندا ئافەراند،

ئەگەر بایەکی توند، کە لە دەریاوە هەڵدەکا

بیانبا

هەر وەك هەورێ، وەك گەڵایێ دەخلیسکێن و
دەچنە شوێنێك و لەسەر زەمینێکی دووردەست دەکەونەخوارێ
کە تۆ لە ژیانتدا هەڵتبژاردبوو و
پاش مردنیش پەناگەی تۆیە
ئەمە بۆ تۆ، چەپکە گوڵێکی داودیی چیلی
بۆ تۆ، ڕۆشنایی ساردی مانگ لەسەر دەریاکانی باشوور
بۆ تۆ، جەنگی گەلان و مشتومڕی من و
دەنگی کپکراوی تەپڵە خەمبارەکانی سەرزەمینی من
برام، بێ تۆ لە دونیادا، چەندە تەنیام.
لە تاسەی ڕوخساری تۆدا داماوم
کە وەك درەختی گوڵکردووی گێلاس، زێڕین بوو
لە هاوەڵیی تۆ کە بۆ من نان بوو، بۆ من شکانی تینوویەتی بوو و
وزەی دەدایە خوێنم، بێبەشبووم
یەکەم جار کە تۆم دیت، کاتێ بوو کە لە زیندان دەرچووبووی
لە زیندانێکی نیوە تاریکدا، کە وەك چاڵی ستەم و ئازار بوو
نیشانەی ستەمم لە دەستەکانی تۆیا دیت
لە نیگای تۆدا لەدوی تیری کینە گەڕام
بەڵام دڵێکی پاکت هەبوو
دڵێ پڕ لە زام و ڕۆشنایی
ئێستاکە من چ بکەم ؟
ئایا دەتوانرێ دونیا بەبێ ئەو گوڵانە وێنابکرێ
کە تۆ لە گشت لایێ چاندبووتن ؟
چۆن دەتوانم بژیم، بێ ئەوەی تۆ ڕێنوێنگەر بی ؟
بەبێ هەستی سوارچاکانەی گەلیی تۆ و توانای هونەریی تۆ ؟
سوپاس بۆ تۆ کە وەها بووی
سوپاس بۆ تۆ، بۆ ئەو ئاگرەی کە بە سروودەکانت هەڵتگیرساند ...

# هۆنراوەی نازم حیکمەت

ئورهان کەمال  نووسەری بەناوبانگی تورك، کە ماوەی سێ (٣) ساڵ لە زیندانی بورسە'دا لەتەك نازم حیکمەت هاوزیندانی بووە و بەسەرهاتی ئەم سێ (٣) ساڵەی نووسیوەتەوە و بڵاویکردۆتەوە و بە شەیداییەوە لەبارەی نازم حیکمەت'ەوە دەدوێت، لەبارەی ئەوەوە گوتەیەکی سەرنجڕاکێشی هەیە، کە دەڵێت "نازم حیکمەت ئامێری هۆنراوەیە." ، لەوەی کە هەر بەرخوردێکی تازە، هەر بیرێکی تازە و هەر وتارێکی تازە، دەستبەجێ دەبووە مایەی سروشی هۆنراوەیەکی تازە بۆ نازم و دەستبەجێ ڕاکێشیدەکردە پای پیتچنە [تابیعە] شەقوشڕەکەی. بەو جۆرە دەتوانرێت بەم ئەنجامگیرییە بگەی، کە گوتەکەی ئورهان کەمال ڕاستە، بەڵام گەورەیی ئەم ئامێرە [نازم]، تەنیا لە خێرایی و فراوانی بەرهەمیدا نییە، بەڵکو گەورەییە کەتوارییەکەی لەوەدایە، کە هەریەك لەم هۆنراوانە لە ئەدەبی تورکیدا، بەرهەمێکی هەڵکەوتەیە و تەنانەت لاساییکردنەوەیان لە توانای هیچ هۆنەرێکدا نییە.

ئەو خاڵە بنەڕەتیانەی کە لە بارەی هۆنراوەی نازم حیکمەت'ەوە دەبێت لەبەرچاو بگیردرێن ئەمانەن :

١. لەنێو هۆنراوەی کلاسیکی تورکدا، کە هۆنراوەی کێش و سەرواداره و لەژێر کارایی هۆنراوەی فارسی و عەرەبیدا بووە، بەتایبەت ئەوەی کە هۆنراوەی چینە خۆشگوزەرانەکان بووە و هۆنراوەی هەنووکەی تورك، کە سەرەتا بە ساتیرە هۆنراوە/گاڵتەجاریی (شعر هجائی) دەستیپێکردووە و لە شێوەی هۆنراوەی ئازاددا درێژەی پەیداکردووە، هۆنراوەی نازم حیکمەت بۆ خۆی قۆناخێکە، کە هیچ پێشینەی نەبووە و پاشڕەوانیشی تەنانەت نەیانتوانیوە لاساییبکەنەوە.

٢. گرنگترین تایبەتمەندی نازم حیکمەت لەوەدایە، کە هاوکاتی سوودوەرگرتن لە خەرمانی واژە و موزیکی هۆنراوەی کلاسیکی تورك، سوودوەرگرتنە لەو تواناییانە، لە کێشی ساتیر، کە کێشی هۆنراوەی "گەلییانە"ی ئاناتۆڵی و هۆنراوەگەلی "دڵدارانە"ی تورکیەیە و دەربڕی هەست و سۆزی چینە بێبەشەکان و گوندییە ژێرچەپۆکەکانە، نازم گشت ئەم جوانیانەی لە خزمەتی

خەبات و ڕۆشنگەری بەکارهێناوە و هۆنراوەی ئەو چەکوشێکە، کە هەردەم لە تەپڵی سەری زۆرداران و ئیمپریالیزمی جیهانی دەدا.

نەدیم گورسل هۆنەر و ڕەخنەگری تورك لە ساڵی ١٩٧٤دا لە ژمارەیەکی گۆڤاری (ئورۆپ)دا کە بە بۆنەی دەهەمین ساڵڕۆژی مردنی نازم حیکمەت'ەوە بڵاوکرایەوە ئەو ئاوای نووسی :
" سەرەڕای گشت فشارەکان، سەرەڕای کینەی دوژمنانی ئەندێشە، کە ڕێگریی بوو لە میلەتی تورك-میلەتی من- درێژەیان بە ئەشکەنجەدانی لاوانی وڵاتی من دەدا، نازم ساتێك لە ئاوازچڕین نەوەستا، ئەو گۆرانی مرۆییانەی چڕی و گۆرانی هیوای خۆیبوونی بە ڕۆژانی داهاتوو و باوەڕی خۆی بە شۆڕش بەو جۆرە، کە خۆی لە ساڵی ١٩٤٩دا لە زیندانی بورسە'دا نووسی " وەك گولەیەك لە ماوەی دە (١٠) ساڵ زیندانندا تێپەڕێ " و گشت ئەو گەلانەی کە لە گۆشە و کەناری دونیادا بۆ نان، بۆ ئازادی؛ بۆ سۆشیالیزم دەجەنگان، دەنگی ئەویان لەنێو دیواری زیندانەکانیان و لە چۆڵەوانی دورخراوگەکانیاندا بیست. کاتێکیش کە دیتیان لەم دەریاچە گەورەیەی ماوخەباتییدا، کە لە هۆنراوەی نازم'دایە، باس لە ئەوان کراوە، شادییەکی بێسنوور و لەڕادەبەدەریان هەستپێکرد ...

" نابێت لەبیربکرێت، کە ئەم دەریاچە گەورەیە سەرچاوەکەی سەرزەمینی ئاناتۆڵی'یە و پێش ئەوەی تێپەڕێ و لەتەك دەریاچەکانی دیکەدا تێکەڵببێت و برژێتە دەریالوشی فراوانی (واژە)وە، کە فەرهەنگی مرۆڤایەتی لێیەوە ڕەگی دەرکردووە، لە ڕێسایەکی میلییەوە چەشەیکردووە.

بۆ ئەوەی بەشداری شۆڕشگێڕانەی نازم لەتەك ئەم فەرهەنگەدا زیاتر دەرکبکەین، باشترە کە ئەو لە مەیدانی تایبەتی چالاکی خۆیدا، واتە زمانێك کە بە هۆیەوە دونیای نیگارکێشییدەکرد، لەبەرچاوبگرین. ئەم زمانە لە هەمان کاتدا هەم لەنێوبردنە و هەم درێژەپێدان. لەنێوبردنە بەو ڕادەیەی کە هۆنراوەی نازم ڕابوردوو بەو جۆرەی کە هەیە، ڕەتدەکاتەوە. بەڵام بە تەختکردن و خستنەسەری شتی تازە بەشێوەیەکی نوێ دەریدەهێنێت. درێژەدانە لەو ڕووەوەی کە هۆنراوەی نازم شتێکی نائاسایی نییە، بەڵکو پێکهاتەیەکی هەنووکەییە لە ڕێسایەکی کۆنی هۆنەرانە بە لەبەرچاوگرتنی ژیانی گەلی تورك، بەدرێژایی مێژوو.

لە هۆنراوەدا دەتوانرێت ئەم ڕێسایە لە دوو ڕەوتدا بخرێتەڕوو، کە هەردووکیان لە پێکهاتێکی کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوەدەگرن. بەڵام دەربڕی دوو لێکدانەوەی جیاوازن. ئەم دوو ڕەوتە بریتین لە هۆنراوەی گەلی و هۆنراوەی دیوانی، یەکەمیان دەماودەمییە، کە پارێزەران و درێژەپێدەرانی دڵداران'ن و دەربڕی بارودۆخی ژیانی گوندییان و لە هەمان کاتیشدا جیهانبینی ئەوانە لە چوارچێوەی زمانێکی سادە و گەلییدا، هەروەها ئەوەی کە هۆنراوەی دیوانی توخمی زۆری لە هۆنراوەی فارسی و عەرەبی لەخۆگرتووە، خۆی بە ئەدەبی پەسەندکراوان دادەنێت و ڕەنگدانەوەی ئایدیۆلۆجی چینی سەروەرە ...

بەپێچەوانەوە، هۆنراوەی گەلیی، چونکە لەبارەی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئاساییەوە بووە و هەردەم پەیوەندی کەتواربینانەی لەتەك دونیا و خەڵکیدا پەرەپێداوە. شتێکی سروشتییە، کە هۆنەری گەلی (ئەویندار) نەیدەتوانی تێڕوانینێکی مێژوویی، کە لە سنووری هوشیاری ئەو تێپەردەکات، بهێنێتە نێو هۆنراوەکەی. لەتەك ئەوەشدا، مێشتاکە ئەم هۆنراوە دەماودەمییە، کەتوارگەرایی سادە و ساکاری تێدادەبینین، کە پەیوەندی گوندییەکانی تورك لەتەك سروشت و کاردا دەستنیشاندەکات.

نازم بەسوودوەرگرتن لە چوارچێوەی هۆنراوەی دیوانی [بەتایبەت لە هۆنراوە سەرەتاییەکانیدا] و توخمی شۆڕشگێڕانەی هۆنراوەی گەلی، گونجاندنێکی تازەی هێناوەتەئاراوە.

نازم بەخۆی دەیگوت، کاتێك کە هۆنراوە دەهۆنێتەوە، بیر لە ئۆرکێسترایەکی گەورە دەکاتەوە. ژمارەیەك لە هۆنراوە سەرەتاییەکانی ئەو لەوانە (داربی دیوانە) و (دەریای خەزەر)، کێش و ئاوازێکی وەهایان هەیە، کە دەڵێی بۆ ئۆرکێسترای فیلهارمۆنیك (Philharmonic Orchestra) نووسراون.

لەبارەی ئەم هۆنراوانەوە نازم خۆی ئاوا دەڵێت :
" بۆ پیادەکردنی نەزمی کێشی هۆنراوەی خۆم، هیچ گرفتێکم نەبوو، چونکە هۆنراوەی دیوانی تەواوترین نموونەی ڕۆڵی کێش، کە دەیتوانی ببێ، خستبوویە بەردەستی من. لەو سەردەمەدا من هۆنراوەم بۆ ئەوە دەگوت، کە بتوانم لەبەرانبەر کۆمەڵێکی فراواندا بیخوێنمەوە."

بەڵام ئەو تەنیا لە چوارچێوەی هۆنراوەی دیوانی سوودوەردەگرێت و بۆ ئامانجێکی تایبەت، چونکە پاش ماوەیەك لە وەڵام بە پرسیارێك، کە لەبارەی سادەیی هۆنراوەیەوە ئاراستەیدەکەن، ئاوا وەڵامدەداتەوە "...، ... لەوانەیە ئەمە کاردانەوەیەك بێت لە بەرانبەر هۆنراوەی سونەتی دیوانی، لە بەرانبەر ئەزموون و ئارایشە هۆشییە خۆرهەڵاتییەکان". نازم ئەم شەیداییەی بۆ ساکاری لە گەلی تورکەوە بە لەبۆماوە وەرگرتووە، کە بۆ خۆی هۆنراوەی ڕەسەنی بە زمانی ڕۆژانە داهێناوە.

ڕاسترە و باشترە بڵێین، زیندان تاقیگەیەکی گەورە بوو بۆ هۆنەر، لەوێندەرێ بوو، کە نازم حیکمەت پەیوەندی ڕاستەقینەی لەتەك زمانی گەلیانەی خەڵك پەیداکرد و توانی بیهێنێتە هۆنراوەی خۆیەوە. ئیبراهیم عەلی گوندییەکی لاو، کە نازم لە زینداندا نیگارکێشی فێردەکرد و پاش دەرچوون لە زیندان، بوو بە نیگارکێشێکی بەناوبانگ و ناوی باڵابان'ی بۆ خۆی هەڵبژارد، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەگێڕێتەوە، کە هۆنەر چۆن کەرەستەی پێویست بۆ هۆنراوەی [دیمەنی مرۆیی] خۆی کۆدەکاتەوە:

"نازم دەچووە گشت ژوورەکانی زیندانەوە، گوێی لە قسەی هەر زیندانییەك ڕادەگرت، کە شتێکی تازە و جیاوازی باسکردایە. لە زیندانییەکەی دەخواست، کە خێراتر قسان بکا و داوای کاخەزی دەکرد تا بینووسێتەوە و بە پەلە دەینووسی. لە ساتێکی چاوەڕواننەکراودا هەڵدەستایەوە و دەچووەوە ژوورەکەی خۆی. پاشان لە پشت پیتچنەکەی دادەنیشت و چەند ساتێك هۆنراوەی دەهۆنییەوە و چاپیدەکرد."

ئەم قۆناخە لە هۆنراوەی نازم حیکمەت'دا بەڕاستی قۆناخێکی تازەبوو، قۆناخێك کە ئیدی چوارچێوەی هۆنراوەی دیوانی'ی لەتەك یاریکردن بە فۆرم، نەیدەتوانی ڕێگربێت لە تەقینەوە و هەڵچوونی بورکانئاسای هۆنراوەی ئەو "دیمەنی مرۆیی وڵاتی من"، لە ڕاستیدا هەڵچوونی هۆنراوە بوو، سەدان لاپەڕە هۆنراوە، کە لە ڕاستیدا هەم هۆنراوە بوو، هەم ڕۆمان، هەم شانۆیی! نازم حیکمەت بەم جۆرە هۆنراوە، ژیانی خەڵکی دەهۆنییەوە، ئیدی نە لە چوارچێوەی هۆنراوەیەکی تایبەتدا دەمایەوە و نە لە چوارچێوەی هەست وسۆزی ژیانی خۆییبوون. جیهانیبوونی هۆنەر دەستیپێکردبوو، هۆنراوەی ئەو لەوە بەدواوە، هۆنراوەیەك بوو، کە پەیوەندی نێوان تاکەکەس و خەڵك و خەڵکی وڵاتانی دیکە و سەرزەمینە

دووردەستەکانیشی دروستدەکرد. ئەو هۆنراوەی مرۆڤی ئەفریکایی و کوبایی و عەرەب و یابانی دەگوت.

بەم جۆرە دەنگهەڵبڕینی گشت ستەمدیتوانی جیهان بوو، کە لە زمانی نازم حیکمەت'ەوە دەهاتەدەرێ، ئەو بەڕادەیەك قسەی بۆ کردن هەبوو، کە پێویستیدەکرد بە ڕەوانی و فراوانی پەخشان بنووسێت و هۆنراوە بهۆنێتەوە. بەڵام لە درێژترین و پەخشانیترین هۆنراوەکانیشیدا، بەردەوامی ئەو ئاوازە لێدەرەی، کە تایبەتمەندی هۆنراوەی نازم حیکمەت 'ە، دەتوانرێت بەدیبکرێت.

لێرەدا دوان لەسەر هۆنراوەی نازم حیکمەت لە توانادا نییە، بەتایبەت کە باسی ژیانی پڕ بەرهەمی ئەو، لەتەك ئەوەی کە لە سەرەتادا بڕیاروابوو، لە چواردە لاپەڕە زیاترنەبێت، وەك دەبینن نزیکەی چل پەڕەی داگرتووە و هێشتاش زۆر خاڵی سەرنجڕاکێشی باسنەکراو ماونەتەوە. لەم ڕووەوە ناچارین باسی تیروتەسەل لەبارەی هۆنراوەی نازم و بەرهەمەکانی دیکەی ئەو، بۆ بوارێکی دیکە هەڵگرین و لێرەدا تەنیا فەهرێستێك لە بەرهەمەکانی ئەو دەخەینەڕوو.

<u>پەراوێز:</u>

**١. ڕایش (Reich) ناوێکە کە خەڵکی ئاڵمانیا لە سەردەمی ئیمپراتۆریدا لە وڵاتی خۆیان ناوە. ڕایشی یەکەم: بە ئیمپراتۆری پیرۆزی ڕۆم گوتراوە. ڕایشی دووەم : ئیمپراتۆری ئاڵمان لە ساڵی ١٨٧١ تا ١٩١٤ز. ڕایشی سێیەم : دەوڵەتی ئاڵمانی هیتلەری لە ١٩٣٣ تا ١٩٤٥ز.**

**٢. ڕێژەبەستن: مەبەست لە ڕێپێوانی تایبەتە، کە بەڕیزی ڕێکوپێك لە بۆنە و ساڵرۆژ و جەژن و مەراسیەکاندا دەکرێ.**

**٣. (پاورقی) مەبەست داستانێکە کە لە بەشی خوارەوەی لاپەڕەی ڕۆژنامە چاپدەکرێت.**

*** لەم ڕۆژانەدا ژمارەیەك خوازیاری گێڕانەوەی ڕەگەزنامەی (تورکی)ین بۆ نازم حیکمەت: کوردستانپرێس، وەرگیراو لە (روزنامەی دوران نو) چاپی تاران-٢٠٠١/٠٢/٢٤). تا ئەو ساتە دەوڵەتی تورکیە ڕەگەزنامەی تورکی بۆ نازم حیکمەت نەگێڕابووەوە. وەرگێڕی کوردی**

## چۆن بەزەییان بەم نیشتمانەدا نەهات ؟

ئایا مرۆڤ نیشتمانەکەی دەفرۆشێ ؟
ئاو و نانی ئەو خواردووە
لەم دونیایەدا لە نیشتمان خۆشەویستر هەیە ؟
جەنابان چۆن بەزەییتان بەم نیشتمانەدا نەهات ؟
پارچە پارچەیان کرد
برچیان گرت و ڕاپانکێشا
کێشمەکێش بردیان و بە کافر پێشکەشیانکرد
جەنابان چۆن بەزەییتان بەم نیشتمانەدا نەهات ؟
دەست و پێ بەستراو لە زنجیر،
نیشتمان، ڕووت و ڕەجاڵ لەسەر زەمین کەوتووە و
لەسەر سنگی دانیشتووە ئەفسەری تەکسازی.
جەنابان چۆن بەزەییتان بەم نیشتمانەدا نەهات ؟
دێت ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژگار لە خوڵگەی ماف بسوڕێ
دێت ئەو ڕۆژەی دەستیان بە هەژمارەکانی ئێوە ڕابگات
دێت ئەو ڕۆژەی کە لە ئەنگۆ بپرسن :
جەنابان چۆن بەزەییتان بەم نیشتمانەدا نەهات ؟

١٩٥٩

## تاسە

سەد ساڵێك دەبێ، کە ڕوخساریم نەدیتووە
باسکم لە کەمەری نەئاڵاندووە
لە بیلبیلەی چاوانی تێڕانەماوم
لە هزری ڕۆشنی پرسیارمنەکردووە
سەد ساڵە کە چاوەڕوانی منە
ژنێك لە شارێ.
هەر دووکمان لەسەر لکێ بووین، بە لکێکەوە
لە لکێکەوە کەوتینەخوارێ و لەیەك جیابووینەوە
سەردەمێکی سەد ساڵەی لەنێوانماندایە
ڕێگەیەکی سەد ساڵە
سەد ساڵە لە تاریکی و ڕۆشناییدا
لە دوی تۆ دەگەڕێم

٦ی جولای ١٩٥٩

## شار، خۆراوا و تۆ

ڕووت و قووت لە ئامێزی منداڵ،

شار، خۆراوا و تۆ

ڕۆشنایيتان لە ڕوخسارم دەدا و

بۆنی زوڵفتان.

ئەم دڵە لێدەرە هی کێیە

کە دەنگی بە ڕووی هەناسەماندا "تەپ تەپ" لێدەدات ؟

هی تۆیە، هی شارە یا هی خۆراوا

یا هی منە ؟

خۆراوا لە کوێدا کۆتایی دێ و شار لە کوێوە دەستپێدەکا

شار لە کوێدا کۆتایی دێ و تۆ لە کوێوە دەستپێدەکەی

من لە کوێدا کۆتاییمدێ و لە کوێوە دەسپێدەکەم ؟

٩ی جولای ١٩٥٩

## دوو ئەوین

دڵێك شوێنی دوو ئەوین نییە

درۆیە.

دەتوانێت ببێت

لە شاری بارانە ساردەکان

شەوانە، لە ژووری میوانخانە، بە پشتا خەوتووم،

چاوم بڕیوەتە بنمیچ،

هەورەکان بە بنمیچەکەدا تێدەپەڕن

بە قورسایی لۆریگەلێ کە بەسەر قیرتاوی تەڕدا تێپەڕن

لای ڕاست، لە دوورەوە

تەلارێکی سپی

لەوانەیە سەد نهۆم و

منارەیەکی زێڕین لە لوتکەیدا دەدرەوشێتەوە.

هەورەکان بە بنمیچەکەدا تێدەپەڕن

وەك بەلەمگەلێك لە تویکڵەشوتی کە خۆریان هەڵگرتبێ.

لەسەر بەلەمێك دانیشتووم

درەوشانەوەی ئاوەکان لە ڕوومەتم دەدا

ئایا لە کەناری ڕووبارێکم

یا لە کەناری دەریایێ؟

ئەوە چییە لەو سینییەدا

لەو سینییە گوڵدارەدا

ئایا توتڕکە یا تووە ڕەشە

لە کێڵگەی "فولیا"م

یا لە دارستانی پڕ بەفری چناران ؟

ژنانێك کە خۆشمدەوێن پێدەکەنن و دەگرین

بە دوو زمان.

دۆستان! چۆن لە دەوری یەکدی کۆبوونەتەوە ؟
ئەنگۆ کە یەکدی ناناسن.
لە کوێ چاوەڕوانی من دەکەن؟
لە چایخانەی «چنارلی» بایەزید
یا لە باخچەی «گۆرکی» ؟
لە شارۆچکەی بارانە ساردەکان،
شەوانە لە ژووری میوانخانە، بە پشتا خەوتووم
چاوانم دەکزێنەوە و لێکنانرێن.
دەنگی ئاوازێك بەرزبووەوە
بە «هارمۆنیك» دەستپێکرد و بە عود کۆتاییهات.
لە ناخما تاسەی دوو شاری گەورە و دوور
ئامێتە بوو بوو.
لەنێو جێ دەرپەڕم و
لەژێر بارانا تا وێستگەی شەمەندەفەر ڕابکەم
- شەمەندەفەرچی، برام، بکەوەڕێ و
من ببە بۆ ئەوێ.
- بۆ کوێ ؟

١٧ی جولای ١٩٥٩

لە ڕێستورانتی «ئاستۆریا»ی بێرلین
کیژۆڵەیەك خزمەتکار بوو
کیژۆڵەیەك وەك دڵۆپە زیوێ
لە ڕاسەری سینییە پڕ و قورسەکانەوە بە ڕووی منا بزە دەکا.
لە کیژۆڵانی سەرزەمینی لەدەستچووی من دەچوو.
بەڵام نازانم بۆ
جار جار ژێر چاوەکانی ئاسمانی هەڵدەگەڕا
بەخت یارنەبوو و
هەرگیز نەمتوانی لەو سەرزەمینانەی ئەو خزمەتیدەکردن، نیشتەجێبم.
تەنانەت جارێکیش لەو سەرزەمینانەی کە من خزمەتمدەکردن ئەو نیشتەجێ نەبوو
پیاوێکی تەمەن نێوەندجی بوو و
پێموایە نەخۆشیش بوو،
پارێزی خواردنی هەبوو.
دەیزانی کە چۆن خەمبارانە چاوبڕیتە ڕوومەتم
بەڵام ئاڵمانی نەدەزانی
سێ مانگ، ڕۆژی سێ جاران هات و چوو
پاشان ونبوو.
لەوانەیە گەڕابێتەوە وڵاتی خۆی
لەوانەشە بەر لەوەی بگەڕێتەوە، مردبێت

٢٣ی جولای ١٩٥٩

## لەبارەی وێنەگەلی ڕۆژنامەوە

### ١

### ڕەشەزام

لە بەرەی یەکەما، لەسەر دوو ستوون
دوو منالّی ڕووتەڵە خەوتوون
لە بەرەی یەکەما، لەسەر دوو ستوون
مشتێ پێست و ئێسقان
کون کون و قەڵیشاوە، گۆشتی لەشیان
یەکێ لە «دیاربەکر»ەوە، ئەوی دیکە خەڵکی ئۆرگانی،
دەست و پێیان لاروویێر
ئێسکەپەیکەریان گەورە و
دەمیان بە هاواری ترسناك داچڕیوە
ئەو دوو بۆقە گچکە
دوو منداڵی منن نەخۆشی ڕەشەزامیان هەیە
کێ دەزانێ، ساڵانە چەند هەزار کەس لە ئێوە
تەنانەت بەبێ ئەوەی لە ئاوی تاڵ تێربن، دێن و دەڕۆن ...
جەنابی ڕاوێژکاریش :
(دەك ڕەشەزام بگرێ)
دەبێژێ " هیچ مەترسی نییە "

ئۆگوستی ١٩٥٩

٢

## سەرۆکی دەزگەی ئاسایش

خۆر لە ئاسمان وەك زامێکی دەم قڵیشاو

خوێنی لێ دەتکێ

فڕۆکەخانە.

پێشوازییکەران، دەست لەسەر ورگ،

کوتەکبەدەستان و جیپەکان،

دیواری زیندان، پۆلیسخانە

پەتگەلی ئاوێزان بە سێدارا

هەواڵگرانی نەناسیش بە پۆشاکی ئاساییەوە

مێردمناڵێ لەناو ئەشکەنجە نەیتوانی خۆی ڕاگرێ

لە نهۆمی سێیەمی دەزگەی ئاسایش خۆی فڕێدایە خوارێ

هەنووکە جەنابی سەرۆکی دەزگەی ئاسایش

لە فڕۆکە دادەبەزێ

لە ئەمەریکاوە گەڕاوەتەوە

بە خوێندنی پیشەیی

لە شێوازەکانی بێدارڕاگرتنیان کۆڵێتەوە

کارەبابەستنیان لە گون زۆر پەسەندکردووە.

لەبارەی ئەشکەنجەگەلێك کە لە وڵاتی ئێمە هەن

کۆنگرەیان بەرپاکردووە

سوودەکانیان ڕۆشنکردوونەتەوە :

سوودی لەبنرهەنگلنانی هێلکەی گەرم

سوتاندنی پێستی لامل بە شەمچە و پارچە پارچە لێکردنەوەی.

جەنابی سەرۆکی دەزگەی ئاسایش لە فڕۆکە دادەبەزێ

لە ئەمەریکا دەگەڕێتەوە،

کوتەکبەدەستان و جیپەکان

پەتگەلی ئاوێزان بە سێدارا

بە گەڕانەوەی مامۆستا شادمانن

١٩٥٩

٣

## سەردانی

لە بەرەی یەکەما، بەرێزەوە، بۆ سەرنجراکێشان
وێنەیەکیان لە سەرووی گۆشەی ڕاستەوە چاپکردووە،
لە ئیزمیر، لە «کۆردۆن»[1]، سەردانی سەربازان ...
نیوەڕۆیە، هەوا گەرمە و دیارە کە ڕۆژێکی درێژە.
لە پێشەوە، جەنەڕاڵی ئەمەریکای ملقیت
دەستی لە تەنیشت کڵاوە زەرچنەکەی
وەك چەقۆ قەساب، بریسکەدار و پان
دژماندەدەم و دەنگی پێی ئەو دەبیستم
هەروەك لافاوێ بەسەر خاکی زێدی مندا دادەبارێ.
جەنەڕاڵی تورك پازدە هەنگاو لە پاشترەوەیە
ڕوخساری نابینم، لە سێبەردایە.
لەوانەیە شەرمن بێت یا تووڕە ...
تەماشای سەربازەکان دەکەم :
ددانیان جیر، نیگایان تاریك،
چاویان بڕیوەتە زەمین.
بۆ وەها سەردانیگەلێ
پێموایە شتێك نەماوە
کە لە ئیزمیر، بەدرێژایی کۆردۆن، بۆی ڕێزەنەبەستن

١٩٦٢

١ - کۆردۆن Kordon شەقامێکە لە ئیزمیر بە لێواری دەریای ئیجە'دا کێشراوە.

بیر لە تۆ دەکەمەوە
بۆنی دایکم بەر لوتم دەکەوێ
دایکی جوانم
بە قەڵاتوشکانی جەژنی دەروونمەوە سوارم
تۆ بە کراسەکانتەوە سەمادەکەی و پرچت پەرشدەبێ
ڕوخساری گەشاوەت وندەکەم و دەدۆزمەوە
هۆی چییە
تۆ وەك برینی چەقۆیەك دێیتەوە یادم
هۆی چییە، وێڕای ئەم گشتە دوورییە، هێشتا دەنگت دەبیستم و
لەجێی خۆم دادەخورپێم!
بەچۆکدا دێم و سەرنجی دەستانت دەدەم و
دەمەوێت دەستیان لێدەم
ناتوانم
تۆ لە پشت شووشەوەی
گوڵی من، من تەماشاکەری حەپەساوی نواندنێکم
کە لە تارماییدا کایەی دەکەم.

٧ی ئۆگوستی ١٩٥٩

## چوار پارچە

مردووانم وەك تۆو بە زەمیندا وەشاند
یەکێ لە «ئۆدێسا» خەوتووە، یەکێ لە ئیستانبول، یەکێ لە پراگ
خۆشەویستترین وڵاتی من زەمینە.
کاتێك نۆرەی من هات، جەستەم بە زەمین داپۆشن.

٦ی ئۆگوستی ١٩٥٩

گوڵی من، ڕەشێنەی چاوانم

لە مردن ناترسێم

لە مردن شەرمەدەکەم

مردن لەتەک لەخۆبایبوونم بەیەکدا هەڵدەشاخێن

١٥ی ئۆگوستی ١٩٥٩

## قاوەخانەی سێ لەکلەکان

لە بڕاگ لە قاوەخانەی سێ لەکلەکان یەکدیمان دەدی،
ئێستاکە لە کەناری شەقامێك، بە چاوانی نووقاوەووە وەستاوم،
تۆ بە دیژایی مەرگێك لە منەوە دووری.
هەرچەندە لە بڕاگ قاوەخانەی سێ لەکلەکان نییە و
تەنیا زادەی خەیاڵی منە.
لە بڕاگ لە قاوەخانەی سێ لەکلەکان یەکدیمان دەدی،
چاوم دەبڕیە ڕوخسارت و لە دڵدا
هەڵبەستی دڵدارییەکانی سلێمان دەخوێندنەوە.
لە بڕاگ لە قاوەخانەی سێ لەکلەکان یەکدیمان دەدی
ئێستاکە لە کەناری شەمایێك، بە چاوانی نووقاوەوە وەستاوم و
تۆ بە دیژایی مەرگێك لە منەوە دووری
وێنایەکی ئامێتە، لە ئاوێنەیەکی شکاودا.
لە بڕاگ لە قاوەخانەی سێ لەکلەکان یەکدیمان دەدی
ئای خوشکم، وای «سۆنیا دانیالو»
هیچ شتێك، زووتر لە مردووان لەبیرناکرێ.

١٨ای ئۆگوستی ١٩٥٩

بەفر ڕێگەی گرت

تۆ دیارنەبووی

لەسەر چیچکان لە بەرانبەرت دانیشتم

بە چاوانی نووقاو

ڕوانیم لە ڕوومەتت

کەشتییەکان تێنابەڕن، فڕۆکەکان نافڕن

تۆ دیارنەبووی

لە بەرانبەرت پشتم بەدیوارێکەوە نا،

هەی قسەمکرد و قسەمکرد و قسەمکرد

بەڵام نەمتوانی دەم بکەمەوە

تۆ دیارنەبووی

بە دەستانم تۆم گرت

دەستەکانم لەسەر ڕوومەتی خۆم بوون

نۆڤەمبەری ١٩٥٩

خۆزگە توانیبام یەک هەفتە سەرم لێبکەمەوە و لە بوخچەیەکدا دایبنێم و قوفڵیدەم

لە تاریکی بوخچەیەکی خاڵیدا

لەسەر شانەکانم، لەجێی سەرم، چنارێک بڕوێنم و

بۆ ماوەی هەفتەیەک لە سێبەریدا ئارامبگرم.

# گیانبەخشێک لە مەیدانی بایەزید [1]

گیانبەخشێ لەسەر خاک ڕاکشاوە

لاوێکی نۆزدە ساڵە.

ڕۆژان لەژێر ڕۆشنای خۆرا

شەوانیش لەژێر بریقەی ئەستێران

لە مەیدانی بایەزیدی ئیستانبوڵ

گیانبەخشێ لەسەر خاک ڕاکشاوە

لە دەستێکیا پەرتووکی خوێندن و

لە دەستەکەی دیکەیا خەونەکانی

- کە بێ دەستپێک، تەواو بوون —

بەهاری ساڵی هەزار و نۆسەد و شەست،

لە مەیدانی بایەزیدی ئیستانبوڵ

گیانبەخشێ لەسەر خاک ڕاکشاوە

وەبەر دەسترێژان دراوە

زامی گوللە

بە نێوچەوانییەوە

هەروەک گوڵەمێخەکی سوور پشکاوە.

لە مەیدانی بایەزیدی ئیستانبوڵ

گیانبەخشێ لەسەر خاک ڕاکشاوە

دڵۆپ دڵۆپ خوێنی

دەتکێتە سەر خاک

تا کاتێک کە

گەلی چەکداری من، بە سروودگەلی ئازادییەوە

لە ڕێوە بگاتە جێ و

مەیدانی گەورە بگرێتەوە ...

١- مەیدانی بایەزید، مەیدانێکە کە دانشگەی ئیستانبول لەوێندەرێیە .... گیانبەخش: شەهید

گۆرانی مرۆڤەکان لە خۆیان جوانترن
لە خۆیان هیوادارتر
لە خۆیان خەمگینتر و
تەمەنیان درێژتر
فرەتر لە مرۆڤەکان گۆرانییەکانمانم خۆشویستوون
بەبێ مرۆڤ ژیام،
بەبێ گۆرانی هەرگیز.
دژەخونیم لە ئەوین کرد،
لە گۆرانییەکانی هەرگیز.
گۆرانییەکانیش هەگیز دژەخونییان لە من نەکردووە.
گۆرانییەکان بە هەر زمانێك گوترابن تێگەیشتووم.
لەم دونیایەدا ئەوەی خواردم و خواردمەوە،
هەرچی گەڕام و سۆراخمکرد،
ئەوەی دیتم و بیستم،
ئەوەی گرتم و تێگەیشتم،
هیچکام و هیچکامیان
هێندەی گۆرانییەکان منیان خۆشبەخت نەکرد.

٢٠ی سێپتەمبەری ١٩٦٠

# کاپەنگی

بۆ «ڤێرا تولیاکۆڤا»

وێڕای ڕێزی فراوانم

دەمەوبەیان، شەمەندەفەرێکی خێرا بێ ئاگاداری هاتە وێستگە

لەنێو بەفرا داپۆشرابوو

من یەخەی پالتۆکەمم هەڵدابووەوە و لەسەر سەکۆکە وەستابووم

لەسەر سەکۆکە جگە لە من کەسی دی نەبوو

یەکێ لە پەنجەرەکانی فارگۆنی خەوتن کەوتە بەرانبەر من

پەردەکەی نیوە کراوەبوو

لاوە ژنێ لە جێگایەکی ژێرینا خەوتبوو

پرچی کاپەنگی، پێڵووەکانی شین

بە لێوە سوور و گۆشتنەکانیەوە، بەناز و تووڕە دیاربوو

کەسێ لە تەختەنوێنی سەرەوەدا خەوتبوو نەمدیت

شەمەندەفەرەکە هێواش و بێ ئاگاداری لە وێستگە دەرچوو

نازانم لە کوێوە هاتبوو و بۆ کوێ دەچوو

لە پشتەوەڕا تەماشامکرد

لە تەختەنوێنی سەرووەدا من خەوتووم

لە ڤارشۆ لە هوتێلی «بریستۆڵ»

سالانێك بوو کە وەها خەوێکی قوڵم لێنەکەوتبوو

هەرچەندە جێگایەکەم تەختێن و تەنگبوو.

ژنێکی لاو لە جێگایەکی دیکەدا خەوتبوو

پرچی کاپەنگی، پێڵووەکانی شین

گەردنی سپی بەرز و بلووریین بوو

سالانێك بوو کە ئاوها خەوێکی قوڵی لێنەکەوتبوو

هەرچەندە جێگایەکەی تەختێن و تەنگ بوو

کات بەخێرایی تێدەپەڕی و لە نێوەشەو نزیکدەبووینەوە

سالانێك بوو كە ئاوها خەوێكی قوڵمان لێنەكەوتبوو
هەرچەندە جریایەكەی تەختێن و تەنگ بوو
لە نهۆمی چوارەمەوە بە پلیكانە دادەبەزم
سەرخەرەكە[١] دیسانەوە خرابووەوە
لەنێو ئاوێنەكانا، بە پلیكانەكانا دادەبەزم
لەوانەیە بیست ساڵەبم و لەوانەیە سەد ساڵە
كات بەخێرایی تێدەپەڕی و لە نێوەشەو نزیكدەبووینەوە
لە نهۆمی سێیەما لە پشت دەرگەیەكەوە، ژنێ پێدەكەنێ
لە دەستی ڕاستیا گوڵێكی خەمگین بە دزواری كرایەوە
لە نهۆمی دووەما لە پەنجەرە بەفرگرتووەكانا لەتەك سەماكەرێكی كوبایی ڕوبەڕوبووم
چالاك و گەنمڕەنگ وەك بلێسەیەك بەرەوڕووم تێپەڕی
«نیكۆلاس گویلێن[١]»ی هۆنەر ماوەیەكە گەڕاوەتەوە «هاڤانا»
سالانێك لە هوتێلە جۆراوجۆرەكانی ئاسیا و ئەوروپا پێكەوەبووین
دلۆپ دلۆپ تاسەی شارەكانمان خواردەوە
دوو شت هەن كە تەنیا بە مردن لەبیردەكرێن
ڕوخساری دایكمان و دیمەنی شارمان
دەرگەوانەكە ماڵئاوایی لە من كرد و پێستی ئامێتەی شەو بوو
كەوتمەڕێ، بەنێو زوقمی هەوا و گڵۆپەكانا كەوتمەڕێ
كات بەخێرایی تێدەپەڕی و لە نیوەی شەو نزیكدەبوومەوە
لەناكاو بەرانبەرم دەركەوتن
ئەوێ وەك ڕۆژی ڕۆشن بوو، بەڵام بێجگە لە من كەس ئەوانی نەدەدی
پەلێك بوون
جزمە لەپێ و شەلوار و چۆخە پۆش
قۆڵ لەنێو قۆڵی یەكدی لە شێوەی خاچی شكاو
دەست لەنێو دەستی یەكدی بە چەكی خودكارەوە
شان لە شانی یەكدی بە كڵاوئاسنی[٢] بێسەرەوە
نێوان شانە و كڵاوئاسنەكانیان بۆشایی بوو

تەنانەت پەخە و ملیان هەبوو، بەڵام سەریان نەبوو
لەو سەربازانە بوون، کە کەس لە مەرگیانا ناگری
کەوتمەڕێ
دیاربوو کە دەترسن، ترسێکی ئاژەڵی
ناتوانم بڵێم کە لە چاوانیانا دیاربوو
سەریان نەبوو تا چاویان هەبێ
دیاربوو کە دەترسن، ترسێکی ئاژەڵی
بە جزمەکانیا دیاربوو
ئایا دەکرێ لە جزمەوە لە ترس تێبگەین
بەڵێ لە جزمەکانی ئەوانا دەکرا
تەنانەت لە ترسانا دەستیان بە تەقەکردن کرد پەیتا پەیتا و بەبێ وچان
لە گشت تەلاران لە گشت بارهەڵگران[۲] و لە گشت زیندەوەران
بەڕووی هەر دەنگ و هەر جوولەیەکا تەقەیاندەکرد
تەنانەت لە کۆڵانی «شوبن» تەقەیان لە ڕیکلامێك کرد، کە نیگاری ماسییەکی ئاوپڕەنگ بوو
بەڵام لە پارچە گەچێ لە دیوار جیادەبووە و نە شووشەیەك دەشکا
بێجگە لە من کەس دەنگی گوللەکانیشی نەدەبیست
مردووان ئەگەر چی پەلێکی "ئێس ئێس"یش بن ناتوانن بکوژن
مردووان زیندوودەبنەوە و دەکوژن، دەبنە کرم و دەچنە نێو سێو
بەڵام ئاشکرابوو کە دەترسن، ترسێکی ئاژەڵی
ئایا ئەم شارە پێش ئەوەی ئەوان بکوژن نەکوژرابوو
ئایا ئێسکەکانی ئەم شارە یەك بە یەك نەشکابوون و پێستی کەوڵنەکرابوو
ئایا لە پێستی بەرگی پەرتووك و لە چەورییەکەی سابوون و لە مووەکانی
تەنافیان چێنەکردبوو
بەڵام ئێستا لە دڵی شەوا و لەنێو بای بەستەڵەکدا وەك نانێکی سپی گەرم
لە بەرانبەریاندا وەستابوو
کات بەخێرایی تێدەپەڕی و لە نیوەشەو نزیکدەبوومەوە
لە شەقامی کۆشکی «بێلڤێدەر» بیرم لە پۆڵۆنییەکان کردەوە

بەدرێژایی مێژوویان بە ئاوازی «مازورکا»یێ باڵەوانانە سەمادەکەن
لە شەقامی کۆشکی «بێلڤێدەر» بیرم لە پۆڵۆنییەکان کردەوە
یەکەمین و لەوانەشە دواهەمین میدالیام لەم کۆشکەدا وەرگرت
لێبڕساوی ئاهەنگەکە دەرگەیەکی سپی پڕ نەخش و نیگاری کردەوە و
لەتەك ژنێکی لاو چوومە هۆڵێکی گەورەوە
بڕچی کاڕەنگی و پێڵووەکانی ئاسمانی
لەویێ بێجگە لە ئێمە کەسی دیکە نەبوو
بێجگە لە تابلۆی ئاو و ڕەنگ و مۆبێلی جوان وەك کەرەستەی ماڵەبووك
لەبەرئەمە
تۆ تابلۆیەك بووی کە بە ئاوێکی ڕوون کێشرابوو و لەوانەشە
ویۆلەیەکی بەردین بووبی
لەوانەشە دڵۆپەیەك ڕۆشنایی بووبی، کە لە خەونەکانمەوە بەسەر لای چەپی سنگما تکاوە
لە نیوەتاریکیدا لەسەر چرپایەکی زێرەوەدا خەوتبووی
گەردنی سپیت پان و بێگەرد بوو
ساڵانێك بوو کە ئاوها قوڵ خەوت لێنەکەوتبوو
لە «کراکوف» لە مایخانەی «کاپرس»یش
کات بەخێرایی تێدەپەڕێ و لە نێوەشەو نزیکدەبینەوە
دابڕان لەسەر مێزەکە بوو لە نێوان فنجانی قاوە و شوشەی ئاولیمۆکەم
تۆ ئەوت لەوێندەرێ داننا
شین بوو لەنێو چاڵاوێکی بەردین
کووڕدەبمەوە و تەماشامدەکەم
پیرەمێردێ بەدەم هەورێکەوە پێدەکەنێ لاڵ و نادیار
بانگدەکەم،
شکانەوەی دەنگم توی ونکردووە و دەگەڕێتەوە
دابڕان لەسەر مێزەکە بوو لە نێو پاکەتی سیگار
گارسۆنی چاویلکە لەچاو ئەوی هێنای بەڵام تۆ داواتکرد
دابڕان دوکەڵێ بوو لوولخواردوو لە نێو چاوانی تۆ

لەسەر نوکی سیگارەکەی تۆ.
لە نێو لەبی تۆدا کە ئامادەبوو بلێی "لای تۆ خۆش"
دابڕان لەسەر مێزەکە لەو سووچەدا بوو کە تۆ ئانیشکت لەسەر دانابوو
دابڕان لەو شتانەدا بوو کە بەبیری تۆدا دەهاتن
لەو شتانەدا کە لە منت دەشاردنەوە
لەو شانەشدا کە نەتدەشاردنەوە
دابڕان لە ئارامی تۆدا بوو
لە بڕوای تۆدا بوو بە من
دابڕان لە ترسی لەڕادەبەدەری تۆدا بوو
لەوەدا کە لەناکاو وەک ئەوەی دەرگەیەک بە ڕووتدا کرابێتەوە
شەیدای کەسێک بی
یا ئەوەی منت خۆشدەوێ و بەخۆت نازانی
دابڕان لەم نەزانینەی تۆدایە
ناتوانم بلێم کە دابڕان لە ڕاکێشی زەوی ئازاد بووبوو
قورسایی نەبوو وەک تاکە پەڕێک
پەریش قورسایی هەیە دابڕان قورسایی نەبوو، بەڵام بوونی هەبوو
کات بەخێرایی تێدەپەڕێ و نیوەشەو لە ئێمە نزیکدەبێتەوە
لە سێبەری دیوارەکانی سەدەکانی نێوەڕاستا کە سەری لە ئەستێران دەسوا ڕۆیشتین
کات بە خێرایی بەرەو دوا دەڕۆیشت
شکانەوەی دەنگی پێمان وەک سەگی زەرد لاواز بوو
بە دوامانا ڕایدەکرد و پێشماندەکەوت.
لە زانکۆی «یاگلون» ئەهریمەن دەسووڕایەوە و نینۆکی بەنێو بەردانا ڕۆدەکرد
هەوڵیدەدا تا ئاسترۆلەیب'ی «کۆپێرنیک» کە لە عەرەبەکانەوە ماوەتەوە
تێکبدا
لەتەک فیزیارانی کاسولیک لە ژێر پاساری بازاری قوماشفرۆشان
سەمای «ڕۆک ئەند ڕۆڵ»* دەکەن
کات بەخێرایی دەڕواتە پێش و لە نیوەشەو نزیکدەبینەوە

سووری «نۆوا هوتا» لە هەوران دەدا
لەوێ کرێکارانی لاو کە لە گوندەوە هاتوون، گیانیشیان
لەتەک میتاڵ
بە بلێسەوە قاڵبڕێژدەکەن و
قاڵبڕێژی گیان لە قلبڕێژیی میتاڵ هەزار جار دژوارترە
لە کلیسای «مریەمی بیرفۆز» زوڕناژەنێ کە لە بان بورجی زنگلولەکە
ساتەکان ڕادەگەیێنێ
نیوەشەوی ژەنی
هاواری کە لە سەدەکانی نێوەڕاستەوە دەهات، بەرزبووە
هەواڵی نزیکبوونەوەی دوژمنی لە شار ڕاگەیاند
بە تیرێک کە لە قوڕگی دا، لەناکاو بێدەنگبوو
زوڕناژەن بە خەیاڵ ئاسوودەییەوە گیانی لەدەستدا
منیش بیرم لە تاڵی مەرگی کەسێک کردەوە
کە نزیکبوونەوەی دوژمن ببینێ و پێش هەواڵدان بکوژرێ
کات بەخێرایی دەگوزەرێ و نیوەشەو وەک لەنگەرگەیەک کە گلۆپەکانی
کوژاندبێتەوە لە پشت سەر بەجێما
دەمەوبەیان شەمەندەفەرێکی خێرا بێ هەواڵ هاتە وێستگە
«پراگ» لە بارانا نوقم بووبوو
سندوقی زیوینی خشڵ نیشانەیەک بوو لە قوڵایی دەریاچەیەکا
سەری سندووقم لادا
ژنێکی لاو تێیدا لە نێو باڵدارە شووشەییەکانا خەوتبوو
پرچی کاڕەنگ و پێڵووەکانی شین
ساڵانێک بوو کە ئاوها قوڵ نەخەوتبوو
سەری سندووقەکەم داخستەوە و خستمە فارگۆنی بارەوە
شەمەندەفەری خێرا بێ هەواڵ و هێواش لە وێستە دەرچوو
لە دواوە سەرنجمدا بازووەکانم بە هەر دوو لامدا شۆڕبووبوونەوە
«پراگ» لە نێو بارانا نوقمبوو

تۆ دیارنیت

خەوتووی لە نیوەتاریکدا لەنێو چرپای زیرەوەدا

چرپای سەرەوە خاڵییە

تۆ دیارنیت

یەکێك لە جوانترین شارەکانی ڕووی زەمین چۆڵ بوو

وەك دەستکێشێ کە دەستی لەنێو دەربکێشی

وەك ئاوێنەگەلێ کە تۆیان نەدیتووە، کوژایەوە

ئاوی «ڤلتاڤا» وەك ئێوارانی لەدەستچوو بەژێر پردەکانا دەڕوا

کۆڵانەکان چۆڵن

بە هەموو پەنجەرەکانا پەردە دادراوەتەوە

ترامەکان خاڵی تێدەپەڕن

تەنانەت بێ شۆفێر و بێ تیکتفرۆش

قاوەخانەکان چۆڵن

چێشتخانە و میوانخانەکانیش

پیشانگەکانیش چۆڵن

تیایاندا نییە نە قوماش و نە کریستاڵ و نە گۆشت و نە مەی

نە پەرتووك و نە بوتڵی ئاوی نەبات یا گوڵە مێخەك

لەم تەنیاییەدا کە شاری وەك تەمێ دایتەنیوە پیرەمێردێ

نوقمی تەنیاییە

بۆ ڕزگاربوون لە خەمی پیری کە دە بەرابەر زیادیکردووە

لە بان پردی «لێژیۆنێرەکان» وردەنان بۆ مراوییان فڕێدەدا و

هەر پاروویەکی لە خوێنی دڵی کە هێشتا لەڕادەبەدەر لاوە

هەڵدەکێشێ

دەمەوێ توند کات بگرم و ڕایگرم

تۆز و خاکی زێڕینی خێرایی لەنێو پەنجەکانما دەمێنێتەوە

لە « ڤاگۆن لی» ژنێك لە چرپاییەی زێرەوەدا خەوتووە

ساڵانێکە ئاوا قوڵ خەوی لێنەکەوتووە

برچی کاپەنگی و پێڵووەکانی شین
دەستەکانی وەك مۆم لە مۆمدانی زیوینا
کەسێ کە لە چرپاکەی سەرەوەدا خەوتبوو، نەمتوانی بیبینم
ئەگەر کەسێك لەوێدا خەوتبێت من نیم
لەوانەشە چرپاکەی سەرەوە خاڵی بێ
تەم خاکی پۆلۆنیای داپۆشیوە
هەروا «بیرست»یش
دوو ڕۆژە فرۆکە نافرێت
بەڵام شەمەندەفەرەکان دێن و دەڕۆن و
بەنێو چاوانی خەواڵوودا تێدەپەڕن
لە بێرلین بەملاوە لە ژوورێکی تەنیادام
ڕۆژی دواتر، بە خۆرەتاوی دەشتە بەفرگرتووەکان لە خەو ڕابووم
لە فارگۆنی چێشتخانەدا دۆیەکم خواردەوە کە «کەفیر»ی پێدەڵێن
کیژۆڵە گارسۆنەکە منی ناسی
دوو شانۆیی منی لە مۆسکۆ دیتبوون
لە وێستگە ژنێکی لاو هاتە پێشوازیم
قەدی باریکتر لە قەدەی مێرووله
برچی کاپەنگی و پێڵووەکانی شین
دەستیمگرت و بەڕێکەوتین
لەژێر خۆرەتاوا بەڕێکەوتین و بەفر لە ژێرپێماندا دەنگیدەهات
ئەو ساڵە بەهار زووتر هاتبوو
ئەو ڕۆژانە بە ئەستێرەی بەیانا پەیامیان دەنارد
مۆسکۆ بەختەوەر بوو، بەختەوەر بووم، بەختەوەر بووین
لە مەیدانی «مایا کۆفسکی» لەناوکاو لێم ونبوویت، لەناکاو ونمکرد
لەناکاویش نەبوو، چونکە سەرەتا گەرمی دەستی تۆم لەنێو دەستم ونکرد
دواتر کێشی نەرمی دەستی تۆ لەنێو لەپی دەستم و
سەرەنجام دەستی تۆ

ئەم دابڕانە دواتر و هەروا لە یەکەمین ساتی بەریەککەوتنی پەنجەکانمان
دەستیپێکردبوو
بەڵام هەر بە جۆرێکی لەناکاو تۆ لێم ونبوویت
ئۆتومبێلەکانم لە دەریای قیرتاوینا ڕاگرتن و لەنێویان گەڕام
تۆ دیارنەبوویت
باخچەکان بەفر دایپۆشیبوون
لەنێو شوێنپێیەکانا شوێنپێی تۆ دیارنەبوو
شوێنپێیەکانی تۆ چ بە چەکمە چ بە کەوش تەنانەت بە گۆرەوی و
پێخاوسیش دەناسمەوە
لە پاسەوانەکانم پرسی
ئایا نەیانتوانیوە بیبینن
ئەگەر دەستکێشەکانی داکەندبێ ناکرێت دەستەکانی نەبینی
دەستەکانی ئەو مۆمدانێکن لە جۆری مۆمدانە زیوینەکان
پاسەوانەکان بەڕێزەوە وەڵامیاندەدایەوە
" نەمانبینیوە "
لە ئیستانبول پاپۆڕێك بە خوڕەی «سەرای بورنو»[1]دا تێدەپەڕێ
سێ کەشتی گچکەی باری ڕادەکێشێ
مراویە دەریاییەکان دەقیژێنن
لە مەیدانی سوورەوە هاوارمکرد و شۆفێری پاپۆڕەکەم بانگکرد
چونکە ماتۆرەکەی هێندە دەنگیدەهات، کە نەیدەتوانی هاواری من ببیستێ
شۆفێرەکە ماندووش بوو و قلۆپچەی نێوقەدی لێ کەوتبوو
لە «مەیدانی سوور» بەرەو کەشتییەکان هاوارمکرد
- " نەمانبینیوە "
لە گشت کۆڵانەکانی مۆسکۆ دەچمە نێو هەموو ڕیزەکان
لە گشت ژنەکان تەنیا دەپرسم
پیرەژنانی خەندەڕوو و بێدەنگ و ئارام بە سەرپۆشی خورییەوە
ژنانی لاو گۆنا سوور و لوتی قنج و کڵاوەکانیان لە مەخمەڵی سەوز

کیژۆڵانی لاویش خڕبن و پاکوخاوێن و پۆشاك جوان
لەوانەیە پیرەژنانی ترسناك و ژنانی توڕە و کیژۆڵانی شل و شێواویش هەبن
بەڵام ئەوانە بە من چی
ژنانی جوان لە پیاوان زووتر دەبینن و لەبیرناکەن
- ئایا نەتانبینیوە؟
پرچی کاڕەنگی و پێڵووەکانی شین
پاڵتۆی ڕەشی یەخە سپی و قلۆپچە گەورەی مروارین
لە «پراگ» کڕی
- نەماندیوە
لەتەك کاتا کەوتمە پێشبڕکێ، هەندێ جار ئەو پێشدەکەوێت و هەندێ جاریش من
کاتێك کات پێشدەکەوێ لە ترسی ئەوەی چیتر ڕۆشنایی سووری کەمکەرەوەی ئەو نەبینم
زراوم دەچێ
کاتێ من پێشدەکەوم، ڕۆشنایی ئەو سێبەرم دەخاتە سەر زەمین و
سێبەم ڕادەکا و
من لە ترسی ئەوەی کە سێبەرم لە پێشی پێشەوە بڕوا و لەبەرچاوم ونبێ
دەکەومەخۆ
دەچمە هۆڵی شانۆ و کۆنسێرت و سینەماکان
نەچوومەتە شانۆی «بۆلشۆی» دەزانم ئۆپێرایەك کە ئەم شەو لەوێ نیشاندەدرێ،
حەزت لێنییە.
لە «کالامیش» چوومە مەیخانەی «ماسیگر» لەتەك «سەعید فایق» سەرگەرمی قسەکردن
بووین، نزیکەی یەك مانگ بوو کە لە زیندان ئازادبووبووم
ئەو لەدەست ئازاری لاکاوڵ خۆی لوولکردەدا و دونیا جوان بوو
دەچمە چیشتخانەکان، بە ئۆرکێسترای «سترات» واتە
جازی گەوران
لە دەرگەوانانی شیك و لە گارسۆنە وڕ و بەخششدۆستەکان
لە لێپرسراوانی پشکنین و لە شەوگەردانی گەرەکەکەمان دەپرسم
- «نەماندیوە»

کاتژمێری منارەی کلیسای «ستراسنۆی» زەنگی نیوەشەوی لێدا
هەرچەندە سالانێکە هەم کلیساکە و هەم منارەکەی وێرانبوون و
گەورەترین سینەمای شار لەجێی ئەو سازدەکرێ.
لەوێدا لەتەك نۆزدە سالیم ڕووبەڕووبووم
هەر لە یەکەم ساتەوە[٤] یەکدیمان ناسی
هەرچەندە ڕوخساری یەکدیمان نەدیتبوو
هەروا وێنەی یەکدیش
بەلام هەر لە ساتی یەکەمەوە یەکدیمان ناسی و سەرمان سەرسوڕنەما
ویستمان تەوقەبکەین
بەلام دەستانمان بەیەك نەدەگەیشتن، چل سال ماوەی نێوانمان بوو
هەروەك دەریای بێسنوور و بەستەڵەکبەستووی باکوور
لە مەیدانی «ستراسنۆی» کە هەنووکە مەیدانی «پوشکین»ە
بەفربارین دەستپێکرد
سەرمامە دەست و پێیەکانم فرەتر
هەرچەندە کە گۆرەوی پەژمینم لەپێیە و نێو کەوش و دەستکێشەکانم کولکینن
ئەو بوو کە گۆرەوی لە پێ نەبوو و پێیەکانی لە پۆستالی سەربازیدا
لە پەڕۆ پێچابوو و
دەستەکانی ڕوتەڵە بوون
سێوێکی نەگەیبو لە دەمی ئەودا چێژی تایبەتی هەبوو و
توندی مەمکۆلانی کیژۆلەیەکی چواردە سالان
لەنێو دەستانی
لە تێڕوانینی ئەودا بالای گۆرانییەك چەندین کیلۆمەتر بوو و بالای مەرگ
یەك بست
هیچ ئاگای لەوە نەبوو کە دەبوو بەسەری بێت
بەلام من دەزانم ئەو چی بەسەردێت
چونکە باوەڕم بە هەموو باوەڕەکانی ئەو هەبوو
ئەوینداری گشت ئەو ژنانە بووم، کە دەبوو ئەو خۆشیبوێن

گشت ئەو هۆنراوانەم هۆنینەوە کە دەبوو ئەو بیانهۆنێتەوە
لە گشت ئەو زیندانانە خەوتم کە دەبوو ئەو بخەوێ
بە گشت ئەو شارانەدا تێپەڕیم کە دەبوو ئەو تێپەڕێ
بە گشت نەخۆشییەکانی ئەو نەخۆشکەوتم
گشت خەوەکانی ئەو خەوتم و گشت خەونەکانی ئەوم دیتن
گشت ونبووەکانی ئەوم ونکردن
برجی کاڕەنگی و پێڵووەکانی شین
پاڵتۆی ڕەشی یەخە سپی و قلۆچە گەورەی مروارین.
- «نەماندیوە»

٢

نۆزدەساڵیم بە مەیدانی «بایەزید»[1]دا تێدەپەڕێ
لە «مەیدانی سوور»[2]یشدا پیاسەدەکات.
من دەڕۆمە «مەیدانی کۆنکۆرد»[3] لەتەك «عابدین»[4] ڕووبەڕوودەبم و پێکەوە
لەبارەی مەیدانەکانەوە دەدوایین
ڕۆژێك پێشتر «گاگارین» بە دەوری گەورەترین مەیدانا سوڕاپەوە
«تیتۆف»یش دەسوڕێتەوە و هەقدە جار و نیو دەسوڕێتەوە بەڵام
هێشتا هەواڵی ئەو نازانم
لەتەك «عابدین» لەبارەی مەیدان و تەلارەکانەوە دەدوێین
لە ژوورە بنمیچییەکەمدا لە هوتێل
ڕوباری «سین»یش بە دوولای « نۆتردام »دا تێدەپەڕێ
شەوانە من لە پەنجەرەکەمەوە، ڕوباری سین وەك کەوانێك دەبینم
لە لەنگەرگەی ئەستێرانا
تامەزرۆیی لاوێکش لە ژوورە بنمیچییەکەمدا خەوتووە
لەتەڵ دووکەڵکێشی سەربانەکانی پاریس تێکەڵبووە
ساڵانێکە ئاوا خەوی لێ نەکەوتبوو

پرچە کاڕەنگییەکەی بە تەوقە بەستووە و پێڵووە شینەکانی هەورێک لەسەر ڕوومەتی
لەتەک «عابدین» لەبارەی مەیدانی نێوکی[ە] و تەلاری نێوکی[ە] دەدوایین
لەبارەی مەولانا جەلالەدین کە لە مەیدانێک دەسووڕایەوە
«عابدین» ڕەنگەکانی خێرایی ناکۆتا لەسەر پەردە دەڕێژێ
من ڕەنگەکان وەک میوە دەخۆم و
«مانیس» میوەفرۆشێکە کە هەموو میوەیەکی دونیا دەفرۆشێ
«عابدین»ی ئێمەش وایە و «ئاونی دولونی»یش هەروا
تەلارەکان و مەیدانەکان و ڕەنگگەلێک کە لەژێر میکرۆسکۆپ و لە پەنجەرەی
موشەکەوە دەبینرێن

هۆنەران و نیگارکێشان و موزیکژەنانیان
عابدین لە هەوشەی سەد و پەنجا بە شەستییەکەیدا وێنەی هێرش دەکێشێ و
من هەروا کە ماسییەکان لە ئاوا دەبینم و هەروا کە ماسییەکان لە ئاوا دەگرم
هەرواش ڕەوتی کات لە سەرزەمینی نیگاریی «عابدین»دا دەبینم و
ڕاودەکەم
روباری «سین»یش وەک کەوانەی مانگ خەوتووە
چەند جار ونمکرد و چەندبارە دۆزیمەوە و دیسان چەند جار ونیدەکەمەوە و
چەند جاریش پەیدایدەکەمەوە
ئەرێ ئاوایە، ئاوایە کچم
بەشێک لە تەمەنی من لەسەر پردی «سین میشێل» کەوتە ڕوباری «سین»ەوە
بەرەبەیانێک کە دڵۆپ دڵۆپ ڕۆشنایی دەڕژێت پارچەیەک لە تەمەنی من
بە قولابی ماسیگریی «مسیو دو پێن»ەوە گیردەبێ
«مسیو دو پێن» لەتەک وێنەیەکی شینی پاریس لەنێو ئاوەکەدا
دەریدەکێسێت و
ناتوانێت پارچە تەمەنەکەی من بە شتێک بچوێنێ
نە بە ماسی و نە بە تاکی کەونە کەوش
«مسیو دو پێن» دووبارە لەتەک وێنە شینەکەی پاریس دەیخاتەوە نێو ئاو و
وێنەکەی پاریش لەجێی پێشووی خۆیدا دەمێنێتەوە

پارچە تەمەنەکەی من لەتەك ڕوباری سین بەرەو گۆڕستانی گەورەی ڕوباران
دەڕوات
بە دەنگی خوڕەی تێپەڕینی خوێن لە دەمارەکانما داجڵەکام
پەنجەکانم بارستاییان نییە
پەنجەکانم لە دەست و پێم جیادەبنەوە و بەرزدەبنەوە و
لە دەوری سەرم دەسووڕێنەوە
نە لای ڕاستم هەیە و نە چەپ نە سەر و نە خوار
دەبێت بە «عابدین» بگوترێت وێنەی ئەو گیانبەختکردووەی کە لە مەیدانی بایەزید کەوتووە
بکێشێ و وێنەی هاوڕێ گاگارین و هاوڕێ تیتۆف کە هێشتا ناو و نیشان و شێوە و
ئاکاریان ناناسم و وێنە دواینەکان و تامەزرۆیی لاوێکش لە ژوورە بنمیچییەکەمدا خەوتووە
ئەم بەیانییە لە «کوبا»وە گەڕامەوە
لە مەیدانی کوبا شەش ملیۆن مرۆڤی سپی و ڕەش و زەرد و دوورگەیەکی نێوکی[٥]
ڕۆشنابەخشیان پێکدەهێنا نێوکی[٦] نێوکەکان[٥] شایی و خەندان
دەتوانی نیگاری بەختەوەری بکێشی، عابدین ؟
بەڵام بەبێ ئاسانپەسەندی
نە وێنەی دایکێك کە شیر بە منداڵێکی فریشتە ڕوخسار و سوورەڵە دەدا
نە وێنەی سێو لەسەر دەستماڵی سپی و
نە وێنەی سوورە ماسیانێ کە لەنێو حەوزی شووشەیی بەنێو بڵقانی ئاودا دەسووڕێنەوە
دەتوانی نیگاری بەختەوەری بکێشی، عابدین ؟
دەتوانی نیگاری کوبا لە نێوەڕاستی هاوینی ١٩٦١ بکێشی ؟
دەتوانی نیگاری "هەزاران سوپاس هەزار سوپاس ئەم ڕۆژیشم دی و
چیدی خەمم نییە" بکێشی ؟
دەتوانی نیگاری "لە هاواناى بەدبەخت لەم ڕۆژەدا ڕۆژی لەدایکبوونە" بکێشی ؟
لە سەد و پەنجا کیلۆمەتری خۆرهەڵاتی هاوانا نزیك ئاستی دەریا دەستێکم دیت
لەسەر دیوارێك دەستێکم دیت
دیواری گۆرانی شادی بوو
دەستەکە دیواری نەوازشدەکرد

دەستەکە شەش مانگان بوو سنگی دایکی نەوازشدەکرد
هەقدە ساڵە بوو دست و مەمکی «ماریا»ی نەوازشدەکرد
نێولەبی برێناوی و بۆنی دەریای «کاریبی»ی لێ دەهات
بیست ساڵە بوو دەست و لاملی کوڕە شەش مانگانەکەی نەوازشدەکرد
بیست و پێنج ساڵە بوو دەست ماوەیەك بوو کە نەوازشی لەبیرچووبوو
دەست سی ساڵە بوو و لە سەد و پەنجا کیلۆمەتری خۆرهەڵاتی هاوانا
لە کەناری دەریا لەسەر دیوارێك دیتم خەریکبوو دیوارەکەی نەوازشدەکرد
تۆ نیگاری دەست دەکێشی عابدین دەستی کرێکاران و ئاسنگەرانی ئێمە
نیگاری دەستی (نیۆکلاس)ی ماسیگری «کوبایی»ش بەپێنووسی ڕەش بکێشە
دەستی «نیۆکلاس»ی ماسیگری کوبایی بەسەر دیواری خانووی تازە نۆژەنەوە
کە لە «هەرەوەزی» وەریگرتبوو جاریکی دیکە نەوازشی دۆزیبیەوە و
چیدی ونیناکاتەوە

دەستێکی زبر و گەورە
دەستێك وەك ڕەقە[٧]
دەستێك کە باوەڕنییە توانیبێتی دیوارێکی دلگراوە نەوازشبکا
دەستێك کە ئیدی باوەڕی بە هەموو شادییەکان هەیە
دەستێکی بڕ لە بەرەکەت و لێوانلێو لە خۆر و دەریا
دەستی ئەو هیوایانەی کە وەك چاوانی فیدڵ لە خاکە بەرەکەتدارەکانا
بەخێرایی شەکرە قامیش سەردەردێنێن و ئاودار و لێوانلێو دەبن لە هەنگوین
یەکێك لەو دەستانەی کە ساڵی ١٩٦١ لە کوبا خانووگەلێکی وەك درەختان
فێنك و ڕەنگاوڕەنگ و دەرختانێکی وەك خانووگەلی ئاسوودەیان لەسەر زەمین دانان
دەستێك کە دەسترێژی بە گۆرانی و گۆرانی بە دەسترێژ گۆڕی
دەستی ئازادی بێ درۆ
دەستییێك کە فیدڵ گوشی
دەستێك کە بە یەکەمین پێنووسی تەمەنی لەسەر یەکەمین کاغەزی تەمەنی واژەی ئازادی
نووسی
کوباییەکان کاتێ واژەی ئازادی دێننە گۆ ئاوایە کە شووتییەکی شیرین لەتبکەن

دەمیان بڕ لە ئاو دەبێ

کیژۆڵانیان کاتێ لێویان بەر واژەی ئازادی دەکەوێ

دڵیان باڵوەفڕێ دەگرێ

پیرەمێردانیان شیرینترین یاداوەریی خۆیان لە بیردا[٨] هەڵدەکێشن و

قوم قوم دەیخۆنەوە

دەتوانی نیگاری بەختەوەری بکێشی، عابدین ؟

واژەی ئازادی بەڵام بەبێ درۆ

لە پاریس ئاوادەبێ

نۆتەردام وەك چرایەکی ڕەنگ نارنجی داگیرسا و کوژایەوە و

لە پاریس گشت بەردە کۆن و نوێکان وەك چرایەکی ڕەنگ نارنجی داگیرسان و کوژانەوە

بیر لە هونەرەکانی خۆمان دەکەمەوە بیر لە هۆنەر و نیگارکێش و موزیکژێنەرەکان و ..تد

دەکەمەوە و تێدەگەم

لەو کاتەوەی کە دەستی مرۆڤ یەکەمین گامێشی لەسەر یەکەمین ئەشکەوت نیگارکێشا

دەریایەکی فراوان لە بزووتنەدایە

لەوەو بەدواوە گشت ڕوباران بە ماسی تازە بە گیای شینی تازە و چێژی تازەیانەوە

دەڕژێنە نێو ئەو و تەنیا ئەوە کە بیابانە و هەرگیز وشکایی نایە

لە پاریس دەبێ داربەڕوویەك هەبێ

یەکەمین داربەڕووی پاریس و باوکی هەموو داربەڕووانی پاریس

لە «ئیستانبوڵ»ەوە لە کەنارەکانی «بسفر»ەوە هاتووە و لە پاریش نیشتەجێ بووە

نازانم هێشتاکە لەجێی خۆی ماوە ؟ ئەگەر مابێت دەبێ دوو سەد ساڵە بێ

دەمەوێ بڕۆم و دەستی ماچکەم

بڕۆم و لە سێبەریا بخەوم

کەسانێ کە کاخەزی ئەم پەرتووکەیان چێکردووە و پیتەکانیان نووسیوەن و دەریانهێناوە و

ئەوانەی ئەم پەرتووکە لە فرۆشگەکانیانا دەفرۆشن و کەسانێ کە دەیکڕن و سەرنجیدەدەن،

هەروا عابدین و من و بەڵای گیانی من بە پرچی کاڕەنگییەوە

له شەمەندەفەردا، ڤارشۆ ، کراکوف ،
پراگ ، مۆسکۆ ، پاریس — هاڤانا
مۆسکۆ ١٩٦١

Rock and roll *

Nowa Huta **

١

١- «نیکۆلاس گویلێن **Nicolás Guillén**» مۆنەری کوبایی (لەدایکبووی ١٩٠٢) کە هاوکات ناسینی کولتووری ئیسپانیایی و ئۆروپی، کولتووری ڕەشپیستەکانیشی ئامێتەی هۆنراوەی خۆی کردووە و بە سروشوەرگرتن لە کەلەپووری نەتەوەیی خۆی گۆرانی هەستە قوڵەکانی ڕەچەڵەکی خۆی هۆنیوەتەوە.
٢. تەوژمی خێرای ئاوە کەوتووەتە کۆتایی بسفر.
************************

٢

١. ناوی مەیدانێك لە ئیستانبوڵ
٢. ناوی مەیدانێکی ناسراوە لە مۆسکۆ
٣. ناوی میدانێکی گەورەیە لە پاریس
٤. «عابدین دینۆ» دۆستێکی وێنەکێشی نازم حیکمەت
***********************

تێبینییەکان وەرگێڕی کورد
[١] ئاسانسور، مصعد
[٢] مەبەست لە خودەی سەربازییە
[٣] مەبەست لە لۆری و ئامرازەکانی بارگواستنەوە
[٤] سات : ساعت، ساعة، سەعات ..
[٥-٦] لە زمانی فاسیدا واژەی (هستە) هەم بە واتای ناوکی میوە و ناوکی گەردیلە [ئەتۆم]، هەم وەك کورتکراوەی (آهستە / ئارام)بەکاردەبرێت،
[٧] ڕەقە : کیسەڵی ئاوی
[٨] بیر : چاڵ، چاڵاو، چاڵە ئاو

# گەڵاڕێزان

بەنجا هەزار هۆنراوە و ڕۆمان و هیدیکەم خوێندنەوە، کە لە گەڵاڕێزان دەدوان
بەنجا هەزار فیلمم دیتن کە گەڵاڕێزانیان نیشاندەدا
بەنجا هەزار جار گەڵاڕێزانم دیت
کەوتن و جەقین و گەنینی گەڵایان
بەنجا هەزار جار لەژێر کەوشەکانما هەستم بە خشە خشی بێگیانیان کرد
لە نێو لەپی دەست و سەربەنجەکانم
بەڵام هێشتا دیتنی گەڵاڕێزان دڵم ئازاردەدا
بەتایبەت گەڵاڕێزانی کەنار شەقامەکان
بەتایبەت ئەگەر گەڵای داربەڕوو بێ
بەتایبەت ئەگەر منداڵان بەوێدا تێبەڕن
بەتایبەت ئەگەر کەش خۆرەتاوی بێ
بەتایبەت ئەگەر ئەو ڕۆژە هەواڵێکی خۆشم لەبارەی هاوەڵێکەوە بیستبێ
بەتایبەت ئەگەر ئەو ڕۆژە دڵم ئازار لێینەدابێ
بەتایبەت ئەگەر ئەو ڕۆژە بێگومانبم لەوەی کە خۆشمویستووە
خۆشیدەوێم
بەتایبەت ئەگەر ئەو ڕۆژە لەتەك مرۆڤەکان و لەتەك خۆمدا لە ئاشتیدا بم
دیتنی گەڵاڕێزان دڵم ئازاردەدا
بەتایبەت گەڵاڕێزانی کەناری شەقامەکان
بەتایبەت ئەگەر گەڵای داربەڕوو بێ

٦ی سێپتەمبەری ١٩٦١ لایبتسیك/ ئاڵمانیای خۆرهەڵاتی

# شارێك

لە چەند بەرەوژوورکە سەرکەوتم و چەند پێچاوپێچ سوڕامەوە و بەرەوپێش چووم
ڕێگەی خۆمم گرتەبەر و ڕۆیشتم و ڕۆیشتم

دەرگەیەك کرایەوە و چوومە ژوور

خۆم لە خۆمدا ونبووم

شارێکی نەناسراو

خانووەکانی بە شێوەی نەناس

هەندێکیان وەك هێلانە مێرووله و هەندیکیان خالی

هەندێکیان سەراپا پەنجەرە و هەندێکیان دیواری کوێر

چوومە کۆلانێکەوە تەنگ و لیتاوی و لار و وێر

سوڕاندمی و سوڕاندمی و هێنامیەوە جێی یەکەم

شەقامێکی قیرتاوم تەیکرد و گەیشتمە نێوەندی باخچەیەك

ڕاستەوڕاست و پانوپۆڕ تا ئاسۆ درێژەی هەبوو

لە گەڕەکێك باراندەباری

گەڕەکی تەنیشتی خۆرەتاوە

لە ڕاسەری سێیەم مانگەشەوە

بە پردێکا تێپەڕیم

لەنێوەیدا گلۆپی ڕۆشن و درەوشاوە

لە نیوەکەی دیکەیدا تاریك و ئەنگوستەچاو

دوو درەختم دیتن لە تەنیشت یەکدی

بە یەکێکیانەوە تەنانەت گەلایەك نەدەبزووا و

دوەمیان خۆی پێچدەدا و دەینالاند و هاواریدەکرد

لە شارێکا هیچ شتێك وەك یەك نییە

بێجگە لە مرۆڤەکانی

هەموویان دووانە و سێیانە و پێنجانە و دەیانە و ملیۆنانەن

هەمووان ترسنۆك

هەموان دلێر

هەموان دەبەنگ

هەموان ژیر

هەموان ئەهریمەن و

هەموان فریشە

٧ی سێپتەمبەری ١٩٦١ لایپتسیك / ئاڵمانیای خۆرهەڵاتی

خۆشهاتی گچكۆله

نۆرەی ژیانی تۆیه

چاوەڕێتن سووریێژه و شەوه و ئاوڵه

مالاریا و وەستانی دڵ و وەرەم و هیدیكه

بێكاری و برسیەتی و هیدیكه

لەیەكدانی شەمەندەفەر، وەرگەڕانی ئۆتۆبوس، كەوتنی فڕۆكه، ڕووداوی كارخانه،

بوومەلەرزه، لافاو، وشكەساڵی و هیدكه

ئەڤینداری و مەینووشی و هیدیكه

كوتەكی پۆلیس و زیندان و هیدیكه

خۆشهاتی گچكۆڵه

ئێستا نۆرەی ژیانی تۆیه

چاوەڕێی تۆ دەكا سۆشیالیزم و كۆمونیزم و هیدیكه

سێپتەمبەری ١٩٦١ لایپتسیك / ئاڵمانیا خۆرهەڵاتیی

## ژیاننامە

ساڵی ١٩٠٢ لەدایکبووم

هەرگیز نەگەڕامەوە شاری لەدایکبووم

حەزم لە گەڕانەوە نییە

لە سێ ساڵیدا لە حەڵەبی نوێ پاشا بووم

لە نۆزدە ساڵیدا خوێندکاری زانکۆی مۆسکۆ

لە چل و نۆ ساڵیشدا لە مۆسکۆ میوانی «چیکا» و

لە چواردە ساڵییەوە هۆنەریم کردە پیشە

کەسانێک جۆرەکانی گیا دەناسن و کەسانێک جۆرەکانی ماسی

منیش گشت جۆرەکانی دابڕان دەناسم

کەسانێک ناوی ئەستێرانیان دەرخە

من ناوی تاسان

هەم لە زیندانان خەوتووم و هەم لە هۆتێلە گەورەکان

برسیم بووە، لەوانە بە مانگرتن لە خواردن، بەڵام لەوانەیە خواردنێکیش نەبێت کە نەمچەشتبێت

لە سی ساڵیدا ویستیان لە سێدارەم بدەم

لە چل و هەشت ساڵیدا ویستیان میداڵی ئاشتی بە من بدەن و

دایان

لە سی و شەش ساڵیدا شەش مانگم لە تێپەڕین بە چوار مەتری چوارگۆشەی

کۆنکرێتا بردەسەر

لە پەنجا ساڵیشدا لە ماوەی هەژدە ساتدا لە پراگەوە بۆ هاڤانا

فڕیم

«لینین»م نەدیتووە هەرچەندە لە ١٩٢٤دا لە بەرانبەر تابووتەکەی پاسەوانیمکردووە

لە ١٩٦١ تەلاری یادەوەریی ئەو کە سەردانی دەکەم پەرتووکەکانی ئەون

ویستیان من لە پارتەکەم جیابکەنەوە

نەکرا

لەژێر بتە تێکشکاوەکانما نەپلیشامەوە

لە ١٩٥١ لەتەک هاوەڵێکی لاودا لە دەریادا بەرەو مەرگ ملم نا

لە ٥٢شدا بە دڵێکی شکاوەوە چوار مانگی ڕەبەق لەسەر پشت خەوتم و لە چاوەڕوانی مەرگدا مامەوە

لەمەڕ ژنانێک کە خۆشمویستن دیوانەئاسا ئێرەییم برد

تەنانەت تۆزقاڵێکیش ئێرەیم بە «چارلی» نەبرد

بە ژنانێک کە خۆشمویستن وەفادار نەمامەوە

بەڵام لە پاشملەی هاوەڵانم وشەیەک نەدواوم

دەمخوارد بەڵام بەنگ نەبووم

شانازیدەکەم کە نانم بە هارەقەی نێوچەوانم بەدەستهێنا

لەبەر کەسانی دیکە بە شەرمەزارییەوە درۆمکرد

لەبەر فریاگوزاریی کەسانی دیکە درۆمکرد

بەڵام هەندێ جاریش بەبێ هۆ درۆمکردووە

سواری شەمەندەفەر و فڕۆکە و ئۆتۆمبیل بووم

زۆرێک هەن کە ناتوانن سواربن

چوومەتە ئۆپێراکان

زۆرینەی خەڵکی ناتوانن بڕۆن و تەنانەت ناویشیان نەبیستووە

ئەو شوێنانەی کە زۆرینەی خەڵک دەڕۆن من لە ساڵی ٢١ بەدواوە نەمتوانیوە بڕۆم

بۆ مزگەوت و کلیسا و کەنیسە و پەرەستگە و لای نووشتەنووس

بەڵام هەندێک جار فاڵی قاوەیان بۆم گرتووە

نووسینەکانم بە سی، چل زمان چاپدەکرێن

لە تورکیەی من بە زمانی تورکی من یاساخن

هێشتا تووشی وەرەم نەبووم

بەدڵنیاییشەوە پێویست نییە تووشبم

سەرۆکشالیار و فڵانیش هەروا تووشنابن و

هەروا ناشمەوێت تووشبم

نەچوومەتە جەنگ

له شەوەزەنگانا ڕامنەکردووەتە پەناگەکان
لە ژێر هێرشی فڕۆکانیشدا لە شەقامەکان ڕانەکشاوم
بەڵام لە دەوروبەری شەست ساڵیدا کەوتمە ئەڤینداری
بە کورتی دۆستان
ئەمڕۆ لە بێرلین تەنانەت ئەگەر لە خەما دیقبکەم
دەتوانم بڵێم کە وەک مرۆڤێک ژیاوم
کەس نازانێت کە چەندێکی دیکە زیندوو دەمێنم و
چی دیکەم بەسەردێت

ئەم ژیاننامەیە لە ١١ی سێپتەمبەری ١٩٦١دا
لە (بێرلین)ی خۆرهەڵاتیی نووسراوە

# جەنگی ئازادی

جارێکی دیکە هاتنەوە، بە پەرتووک و سروود و ئاڵاکانیانەوە،
شەپۆل شەپۆل، بوونە ڕۆشنایی و
بەرەو تاریکایی هێرشیانبرد،
جارێکی دیکە مەیدانەکانیان گرتنەوە.
گیانبەختکرووێەک کە لە مەیدانی «بایەزید»دا کەوتبوو
خۆی تەکاندا و هەستایە سەرپێ،
برینەکەی خۆی وەک خۆرێک بەرزکردەوە
ئەشکەوتی «پاتشای ماران»ی وێرانکرد
هێستا ئەو ڕۆژە نەهاتووە، ئاڵاکانتان نەپێچنەوە
گوێڕادێرن، ئەوەی دەیبیستن نوزەی کەمتیارانە
پیزەکانتان چڕتر بکەن هاوڕێیان
ئەم جەنگە، جەنگە دژی فاشیزمە، جەنگی ئازادییە.

١٩٦١

شەست ساڵەم
لە نۆزدە ساڵییەوە خەونێك دەبینم
لە بارانا لیتەی هاوین و زستان
لە خەو و بێداریا
شوێن خەونەكانم كەوتم و دەڕۆم
دابڕان چتەكانی لە من سەند و بردنی.
چەند كیلۆمەترێ هیوا و چەند خەروارێك خەم،
بڕچێك كە شانەمكرد و دەستانێك كە گوشیمن.
تەنیا لە خەونەكەم دانەبڕاوم
لەتەك خەونەكەم ئۆروپا و ئاسیا و ئەفریكا گەڕام
تەنیا ئەمەریكییەكان ڤیزایان ناوێ
فرەتر لە دەریا و كێو و بیابانەكان، مرۆڤەكانم خۆشدەویستن و
لە مرۆڤەكان سەرمسوڕما
لە زیندانا تیشكی ئازادیم بوو
لە دوورخراوگە نان و دۆ
لە هەر شەوێكا كە دەچوو و لە هەر ڕۆژێكا كە دەهات :
خەونی گەورەی ڕزگاری نیشتمانم.

١٩٦١

## بۆ نووسەرانی ئاسیا و ئافریکا

برایانم
مەڕوانە زەردی پرچم
من ئاسیایم
مەڕوانە شینی چاوانم
من ئافریکایم
لە وڵاتی من، درەختەکان سێبەر ناخەنە سەر پێی خۆیان
وەك وڵاتی ئەنگۆ
لە وڵاتی من، نان لە گەرووی شێردایە
لەسەر کاریزان ئەژدیها ڕاکشاوە
مەرگ بەر لە پەنجا ساڵی دێ، لە وڵاتی من
وەك وڵاتی ئەنگۆ
مەڕوانە زەردی پرچم
من ئاسیایم
مەڕوانە شینی چاوانم
من ئافریکایم
لە سەدا هەشتای خەڵکی وڵاتی من، خوێندنەوە و نووسین نازانن
لەوێندەرێ هۆنراوەکان دەبنە گۆرانی و دەماودەم دەگەڕێن
لە وڵاتی من، هۆنراوەکان دەتوانن ببنە ئاڵا
وەك لە وڵاتی ئەنگۆ
برایانم
دەبێ بتوانرێ هۆنراوەکان لە گای لەڕ و لاواز ببەسترێن و
زەوی بکێڵن
دەبێ بتوانن، لە کێڵگەکاندا
تا ئەژنۆ لە گۆلاوا ڕۆچن
دەبێ بتوانن، گشت شتێ بپرسن

دەبێ بتوانن، گشت تیشکەکان چەپکبکەن

دەبێ بتوانن، وەك بەردی کیلۆمەترژمێر

لە سەرەڕێگەکان ڕاوەستن، هۆنراوەکانی ئێمە

دەبێ بتوانن، بەر لە هەموان ببینن، کە دوژمن نزیکدەبێتەوە

دەبێ بتوانن، لە دارستانەکان، تام تامەکان بکوتن

تا ئەو کاتەی کە لە جیهانا وڵاتێکی دەستەمۆ و مرۆیەکی دەستەمۆ

لە ئاسمانیش هەورێکی ئەتۆمی بمێنێ

هۆنراوەکانی ئێمەش، دەبێ هەرچیان هەیە لە گیان و ماڵ و بیر و ئەندێشە

لە ڕێی ئازادی بێسنووردا ببەخشن

٢٢ی جێنیوەری ١٩٦٢ مۆسکۆ

## ئیسپانیا

هەندێکمان شەست ساڵەین و هەندێك لێکدابڕان و

هەندێکیش دەمێکە ئێسکیان بووەتە خاك

ئیسپانیا لاوێتی ئێمەیە

ئیسپانیا گوڵێکی خوێنینە لەسەر سنگمان پشکووتووە

ئیسپانیا هاوەڵێتی ئێمەیە لە ژێر ڕۆشنایی هیوای پتەو و

درەختانی پیری زەیتوونی لك و پۆپ شکاو و خاك زەرد و سووری

ژێر و ژوور کراو

هەندێکمان شەست ساڵەین و هەندێك لێکدابڕان و

هەندێکیش دەمێکە ئێسکیان بووەتە خاك

مادرید لە ٣٩دا تێکشکا

لەو ڕۆژەوە تا ئێستا هەرچی بەسەر نەوەی ئادەما هات لە تاڵ و شیرین

ئیسپانیا لە ٣٩دا تێکشکا و

دەنگی گەرم و تووڕەی هیوای ئێمە کە ڕۆشناییەکەی لە بێلبائۆ

تێکنەشکا

ساڵی ٦٢ لە کانەکانی نەمسا بەرزە

ئیسپانیای لاوێتی ئێمە بوو ئیسپانیا لاوی ئێمەیە

ئیسپانیان چارەنووسی هەموومانە

٢٠ ئایاری ١٩٦٢ مۆسکۆ

دونیا بدەینە دەستی منداڵان ئەگەر تەنیا بۆ ڕۆژێکیش بووە
وەك موزەڵانێکی ڕەنگاوڕەنگ بیدەینە دەستیان تا یاری پێبکەن
بەدەم گۆرانیگوتنەوە لەنێوان ئەستێران یاریبکەن
دونیا بدەینە منداڵان
وەك سێوێکی گەورە و وەك لەواشەیەکی گەرم
بەلایەنی کەمەوە ڕۆژێك زکیان تێربێت
دونیا بدەینە منداڵان
ئەگەر تەنیا بۆ ڕۆژێکیش بووە، دونیا لەتەك هاوەڵێتی ئاشنابێت
منداڵان دونیا لە دەستی ئێمە دەستێنن و
درەختانی هەمیشە نەمر لەسەری دەڕوێنن

٢١ی ئایار ١٩٦٢

## لێبڕساراوانی ڕێنوێنی

لێبڕسارانی ڕێنوێنی قیت ڕاوەستاون،
دەست و باسکیان دەشەکێنن و ئەبرۆیان پەیوەستکردووە
ئازادی ئێمە لە نووکی کوتەکەکانی ئەواندایە
لێبڕسارانی ڕێنوێنی قیت ڕادەوەستن،
تا ئەو دەمەی کە خەڵکی هێشتاکە یەکدی خۆشویستن فێرنەبوون.

٢٣ ئایاری ١٩٦٢
مۆسکۆ

گشت دەرگەکان داخراون و گشت پەردەکان دادراونەتەوە
لەکوێن لەکوێن لە کوێن
لە جێیەکا نادیارن نادیارن نادیارن
لالان لە دوور دوورەوە بۆ گەڕان دەدوێن
ئیگا چاوی نییە و ڕۆیشتن با
ماندووم لە گەڕان بەدوای ئەستەما
با سیگارێك بكێشم

٢١ی ئایاری ١٩٦٢

## ژمارەکان چی دەڵێن

ژمارە باڵۆسەی ساوایانە

ژمارە تابووتی شارانە

ئەو شارانەی کە کوژران

یان ئەوانەی دەکوژرێن

ژمارە بێژەری شتگەلێکە کە لێمان نزیکدەبنەوە

ژمارە بێژەری شتگەلێکە کە لێمان دووردەکەونەوە

ئەوە چییە لێمان نزیکدەبێتەوە و

ئەوەی لێمان دووردەکەوێتەوە چییە ؟

جەنگی جیهانی : یەکەم

جەنگی جیهانی : دووەم

لە ١٤وە تا ١٨و لە ٣٩وە تا ٤٥ دە ساڵ ٥٤ ملیۆن کوژرا و

٤٩ ملیۆن پەککەوتە

وڵاتی کوژراوان و پەککەوتان

وڵاتێکی ١٠٣ ملیۆن کەسی

بە هەتیو و دێوانە و بەردە سوتاوەکانیشییەوە

یەکێ لەدەستچووان لە ماڵەکەی ئێمە بوو

ڕۆیی و چیدی نەگەڕایەوە

لەبیرم نییە، کە نۆزدە ساڵە بوو یان چل ساڵان

بە دوو چاوی کوێرەوە گەڕاوە

لەبیرم نییە، کە چاوشین بوو یان چاوڕەش

بە لاقی لە ئەژنۆوە بڕاوی چەپەوە گەڕاوە

گەڕاوە و نەیتوانی دەرگەی خانووەکەی بدۆزێتەوە

لە ١٤وە تا ١٨و لە ٣٩وە تا ٤٥ دە ساڵ ٥٤ ملیۆن کوژرا و

٤٩ ملیۆن پەککەوتە

لەسەر زەوی بە هەژماری سەر ، ئێستە ٢،٥ ملیارد کەسین

لە سەدا هەشتامان برسین

ددانەکانمان دادەڕزێن
ڕووکمان بڕ لە زامە و
پێستی مردووی لەشمان شەو شەو
بەتایبەت مناڵانمان
بە سەری زلی لەرزۆکەوە
بە چاوی گەورە و خەماوی لە ڕوومەتی بڕ چرچ و لۆچیانا
زگیان بەسەر لاقە لەڕ و لاوازەکانیانا، وەکو تەپڵ
لەسەر زەوی بە هەژماری سەر ، ئێستە ٢،٥ ملیارد کەسین
لە سەدا هەشتامان برسین
ساڵی ١٩٦٢ەوە
لە ساڵی ٦٢دا گەر دوو فڕۆکەی جەنگی بخەینە سەر خوان
بیانکەینە ساڵاد و شەراب و گۆشت و نان
٤٠ ملیۆن مرۆڤ دەخۆن و دەخۆنەوە و تێردەبن
پاشماوەی نان و گۆشت بۆ ٤٠ ملیۆن پشیلەش بەسدەبێ
پشیلان ساڵاد ناخۆن و شەراب ناخۆنەوە
من میوانیی پشیلەم کردووە
موشەکە بالیستیکەکانم لە تێلەفزیۆندا دیتوون
دوو موشەکی بالیستیك ١٥٠ پەرتووکخانە بەرلەوەی دامەزرێن
دەسوتێنن و دەکەنە خۆڵەمێش
لەوانەیە پەرتووکی منیش لەنێوانیاندا بێ
لە ساڵی ٦٢دا فڕۆکەی بۆمبوەشێنت دیتووە ؟
دوا مۆدێلیان
دوو فڕۆکەی بۆمبوەشێن چوار نەخۆشخانە لەتەك بۆمبەکانیان
لەخۆ باردەکەن
چوار نەخۆشخانەی گەورە و ڕوناك، کە هێشتا چێنەکراون و
بە چەرپا و دەزگەی وێنەگریی و هیواکانیانەوە
لە ساڵی ٦٢دا پێشبڕکێی پڕچەکبوون بە ئەتۆمی و نائەتۆمییەوە ساڵانە ١٢٠ ملیارد دۆلار

لە ١٠ ساڵدا ٢٠ هەزار ملیارد لیرە

نازانم لە هەژماری ئەستێرانەوە نزیکە یان نا ؟

١٢٠ هەزار ملیارد

یا ١٥٠ ملیۆن خانووی چێنەکراو

خانووگەلێك کە دەبوو چێبکرێن بەڵام نەکران

تارمایی ١٥٠ ملیۆن خانوو

پێنج ژوور بە ئاو و کارەبا و گەرماوەوە

دەرگە و پەنجەرەی ١٥٠ ملیۆن خانوو

شوشەکانیان کاتێ کە خۆر هەڵدێ و

سێبەریان لە خۆرئاوابووندا و

بالکۆنەکانیان لەژێر تریفەی مانگەشەوا

ورچ لانەی هەیە و

شەیتانۆڵکە قاوخێك

بەڵام باری ئێمە ئەمەیە

پیاوێك دەناسم

بە دوو دەست و لاقەوە

بە سمێڵی ڕەشی قەیتانییەوە

ئەو ساڵ بۆتە سی ساڵ

دوو کوڕەکەی ئەو یەکێ حەوت ساڵان و ئەو دیکە شەش مانگان

لەتەك خەسوو و خەزووری و

وێنەیەك کە لە سەربازیدا گیراوە، یان هی ئەو خۆیەتی

یان هی باوکی مردووی

یان هی خەزووری

لەگانێك و

تەنیا یەك ژوور

سەد و پەنجا ملیۆن خانوو و

هەر یەك لەم خانووانە

بە زوور و دەرگە و ئاو و مێزی نانخواردنیانەوە
لە ساڵی ٦٢دا پێشبڕکێی پڕچەکبوون بە ئەتۆمی و نائەتۆمییەوە ساڵانە ١٢٠ ملیارد دۆلار
لە ١٠ ساڵدا ١٢٠ هەزار ملیارد لیرە
یان ١٥٠ ملیۆن خانووی چێنەکراو
خانووگەلێك کە دەبوو چێبکرێن، بەڵام نەکران
خانووی ئەو پیاوەش کە دەیناسم لەنێوانیاندا
لە بالکۆنەکەیدا ڕوناکی مانگ
لە ساڵی ٦٢دا پێشبڕکێی پڕچەکبوون بە ئەتۆمی و نائەتۆمییەوە ساڵانە ١٢٠ ملیارد دۆلار
یان بە هەژماری سەر، یەك ملیارد کەس ناونووسی کوژران
لایەنیکەم نیوەی وشکانییەکان ئامادەی مەرگ
نیوەی گشت درەخت و ماسی و گشت بارانەکان
لایەنیکەم نیوەی کۆرپەلەکان ئامادەی مەرگ
ئایا دەکرێ سەرابا لە چەك داماڵرێین
ئایا لە ساڵی ٦٣دا یان ٦٥دا دەکرێ
خۆزگە لە گشت هەرێمەکان بە ئەتۆم و بێئەتمەوە لە چەك داماڵرێین
هەروەك مرۆڤ لە خۆشییەکانی ڕووی زەوی بەهرەمەندبین و
ئەو خۆشیانە چوار بەرابەر کەین
بەو جۆرە، لە ماوەی سێ مانگدا برسیەتیمان پیشەکێشدەکرد
ئیدی دندانەکانمان دانەدەڕزان
پوکەکانمان نەدەبوونە برین
بەتایبەت منالەکانمان
خەم لە چاوانیان دەڕەوییەوە
لاقە لاروویرەکانیان ڕاستدەبوونەوە و
زگە باکردووەکانیان دادەمرکانەوە
ژمارەکان چی دەڵێن؟
دەبێت چی بڵێین ؟
ئەوە چییە کە لێمان نزیکدەبێتەوە ؟
ئەوە چییە کە لێمان دووردەکەوێتەوە ؟

١٧ی جونی ١٩٦٢

# دژەخون لە نیشتمان

" نازم حیکمەت هێشتاکە درێژە بە دژەخونی لە نیشتمان دەدا."

" حیکمەت گوتویەتی : ئێمە نیوە داگیرکراوی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاین."

" نازم حیکمەت هێشتاکە درێژە بە دژەخونی لە نیشتمان دەدا."

ئەمانە لە یەکێ لە ڕۆژنامەکانی ئانکارا چاکران، لە سێ ستووندا بە پیتی ڕەش.

بە پیتی گەورەی ناپێلێ

لە یەکێ لە ڕۆژنامەکانی ئانکارا، لە تەنیشت وێنەی سەرۆکی هێزی دەریایی "ویلیامسۆن"

سەرۆکی هێزی دەریایی ئەمەریکا، لە هەشت و هەش سانتیمەتری چوارگۆشەدا پێدەکەنێ،

دەمی تا بناگوێی بازە ئەمەریکا سەد و بیست ملیۆن لیرە یارمەتی بودجەی ئێمەی دا. سەد و بیست ملیۆن لیرە.

" حیکمەت گوتویەتی : ئێمە نیوە داگیرکراوی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاین."

" نازم حیکمەت هێشتاکە درێژە بە دژەخونی لە نیشتمان دەدا."

بەڵێ، من دژەخونم لە نیشتمان، ئەنگۆ نیشتمانپەروەرن، ئەنگۆ وڵاتپەروەرن.

من دژەخۆنم لە نیشتمان، من دژەخونم لە وڵات.

ئەگەر نیشتمان کێڵگەی ئێوەبێ

ئەگەر نیشتمان ئەو شتە بێ کە لە کاسە پۆڵایینەکانی ئەگۆ و لە پەڕاوی چەکە بانکەکانتاندایە.

ئەگەر نیشتمان مردن لە ڕۆخی شەقامەکانا بێ،

ئەگەر نیشتمان سەگلەرزە بێ لە زستانا و ژان و تا بێ لە هاوینا،

ئەگەر نیشتمان مژینی خوێنی سووری ئێمە بێ لە کارخانەکانا،

ئەگەر نیشتمان چنگی سەرۆکانتان بێ،

ئەگەر نیشتمان فەرمانداریی کوتەک و شەلاقی پۆلیس بێ،

ئەگەر نیشتمان سەرمایەگوزاری و مووچەتان بێ،

ئەگەر نیشتمان پێگەی ئەمریکایی، بۆمب و تۆپ و گەلەکەشتی ئەمەریکایی بێ.

ئەگەر نیشتمان ڕزگارنەبوون لە تاریکایی بۆگەنی ئەنگۆ بێ،

من دژەخونم لە نیشتمان.

بنووسن، لە سێ ستووندا، بە پیتگەلی گەورە و ڕەش و ناپێلێ

نازم حیکمەت هێشتاکە درێژە بە دژەخونی لە نیشتمان دەدا.

۲۸ جێنیوەری ۱۹٦۳

## سوپای برسیان بەرەوپێش دەڕوا

سوپای برسیەتی بەرەوپێش دەڕوا
بۆ پێشەوە دەڕوا بۆ بەهرەمەندی لە نان
بەهرەمەندی لە گۆشت
بەهرەمەندی لە پەرتووک
بەهرەمەندی لە ئازادی
بەرەوپێش دەڕوا لە پردگەلێك تێدەپەڕێ باریکتر لە موو، تیژتر لە شمشێر
بەرەوپێش دەڕوا بە تێکشکاندنی دەرگە ئاسنینەکان و ڕوخانی دیواری قەڵاکان
بەرەوپێش دەڕوا بە پای لەخوێناگەوزاو
سوپای برسیەتی بەرەپێش دەڕوا
دەنگی هەنگاوەکانی هەورەگرمە ئاسا
سروودەکانی ئاگرین
لەسەر بەیداخی نەخشی هیوا
هیوای هیواکان لەسەر بەیداخی
سوپای برسیەتی بەرەوپێش دەڕوا
شارەکان کۆڵکێشدەکا
شارەکان بە کۆڵانی باریك و خانووە تاریکەکانیانەوە
دووکەڵکێشی کارخانەکان
ماندووبوونی ناکۆتای پاش کار
سوپای برسیەتی بەرەوپێش دەڕوا
مانگ و کۆڵیت و گوندەکان لە دووی خۆی ڕاکێشدەکا
هەروا کەسانێکیش کە لەم سەرزەمینە بەرینەدا، لە بێزەمینیدا مردوون.
سوپای برسیەتی بەرەوپێش دەڕوا
بەرەوپێش دەڕوا تا بێبەشان لە نان بگەیێنێ بە نان
تا بێبەشان لە ئازادی بگەیێنێ بە ئازادی
بەرەوپێش دەڕوا بە پای لە خوێناگەوزاو

ئۆگوستی ١٩٦٢

# ڕاپۆرتی تانگانیکا

## نامەی یەکەم

وا بەسەر دەشتەکانی ئۆکرانیا دەفڕم.
چەند ساڵێکە، یەکەمین فڕینمە بەبێ تۆ.
ساتێك لە زەمین دادەبڕام، لە دوی دەستی تۆ گەڕام،
خووێکە،
هەروا لە ساتی نیشتنەوەشدا دەگەڕێم.
دوێ شەو، کاتێ جانتاکەمت ئامادەدەکرد،
شانەکانت خەمگین بوون،
لەوانەشە نەبووبن و من پێموابووبێ، چونکە دەمویست وا بێ.
ئەم بەیانییە بە ڕۆشنای بەفر بەئاگاهاتم.
مۆسکۆ لە خەودا بوو، تۆش لە خەودا بووی.
بڕچت کاڕەنگی بوو، پێڵوەکانت شین،
گەردنی سپیت، خڕ و کشابوو.
بارێ خەم لەسەر لێوە سوورباوەکانت نیشتبوو،
لەوانەشە نەبووبێ و من پێموابووبێ، چونکە دەمویست وا بێ.
لەسەر پەنجەی پێ چوومە ژوورەکەی دی.
وێنەیەکی نیوەبۆش، لەسەر مێزەکەم، سەری بەرزکردبووەوە،
تەماشای خۆرەتاوی هاوینی دەکرد.
ڕۆیشتنی من بۆی گرنگنەبوو.
هەڵمگرت و خستمە نێو گیرفانمەوە.
ئاسمان تەواو ڕۆشنبووەوە
تابلۆی ڕەنگ و ڕۆنیی «دینۆ»[1] بە دیوارەوە بوو :
پەڵەهەورێك بە قوڵایی ئاسمانەوە،
لەوانەیە نە ئاسمانێك هەبێ و نە هەورێك
بزووتێکی سپییە لەسەر شینایی بێپایان
نیگاری خۆشبینی، نیگاری هیوا.

ژنانی لەچکەدار لە حەوشەدا، خش خش، کەوتنە بەفرماڵین
تۆ هاتیتە ژوور
تەماشای دەموچاوم دەکەی، واقوڕماو و خەمگین.
لەوانەشە خەم نەبێ، خوماریی خەو بێ.
گوتم "مەبێ بۆ بەڕێکردنم"
هەرچەندە کە نازانی چەندە دەمویست بێی.
جانتاکەمت بەدەستی خۆت پێچایەوە.
من دەرگەکەم کردەوە و بە پێپلیکانەکاندا چوومە خوار.
تۆ لەنێو ژوورەکەدا، دیمەنێکی بەهاریی بووی، لەلە چوارچێوەی دەرگەدا،
دیمەنێکی بەهاریی لە ڕۆشنایی نیوەڕۆدا،
گەڵاکان و ئاهەکان، ڕۆشنیی تەواو، بەبێ سێبەر
دەرگەکەم بە ڕووتا داخست.
تا « قۆنوکۆقۆ» لەتەک «ئەکبەر» لەبارەی تۆ دواین
یا ڕاستر بڵێم، من دوام و ئەو گوێیڕادێرا.
بەسەر دەریای ڕەشدا تێدەپەڕیم، لە بەرزایی هەشت هەزار مەتری
نازانم لە بیرت دێ، نزیکەی ساڵێ لەمەوبەر،
لەتەک تۆ فڕین، بەسەر فارشۆ و ڕۆم و پاریس، بۆ قاهیرە
ئایا بێ تۆ قاهیرە هەمان قاهیرەیە ؟
لە بەرزایی هەشت هەزار مەتری بەسەر « ئاناتۆڵی » خۆمەوەم
هەشت هەزار مەتر پایینتر، لەژێر هەورانەوە، لەسەر خاکی من، زستانی سەختە
ماوەیەکە ڕێگەی گوندەکان بەستراوە
هەر یەکەیان لە دەشتە بەفرگرتووەکاندا دابڕاوە.
شلە ساوەری بێ ڕۆن
بەربڵاو چرەدوکەڵ دەکا و چاو چاو نابینێ
ساوایان دەمرن، پێش ئەوەی ئەسپێ لەشیان داگیربکا
من لە بەرزایی هەشت هەزار مەترەوە، لەسەرووی هەورانەوە دەفڕم
ئاوایە، «تولیاکۆڤا» ...

١. مەبەست لە دینۆ «Dino»ی نیگارکێش، هاوەڵی «نازم حیکمەت»ە.

# نامەی دووەم

لە قاهیرە، باخی «ئوزبەکیە»ت لەیادماوە؟

چووم و کورسییەك کە پێکەوە لە بانی دانیشتبووین، دۆزیمەوە.

هێشتا با شکاوەکەیان چینەکردووە

ئەو بوو، لەیادتە ؟

لە بەرانبەرمانا، ڕۆشنایی ئەستێرە و ئۆتۆمەبێلەکان لە شووشەبەندەکانا، ئاوێتەبووبوو و

گەداییێك بە دیزداشەوە.

لەیادتە کە پێکەوە، لەو ژنە خەمبارە دوایین

کە ڕوخساری وەك «نێفەرتیتی»ی شاژن وابوو

هاوسەرە کۆمونیستەکەی پێنج ساڵ بوو گیانەڵای بوو

لەنێو بیابان، ئوردووگەی کاری زۆرەملێ

باخی «ئوزبەکیە»ی قاهیرەت لەبیر دێ ؟

چووم، کورسییەك کە لەسەری دانیشتبووین، دۆزیمەوە ..

هێشتا با شکاوەکەیان چینەکردووە

بە ڕۆژ، درەختەکان تەپوتۆز دایگرتوون

گەدا دیزداشەپۆشەکە، بۆتە مشتێ پێست و ئێسقان،

هاوسەری ژنە خەمبارەکەش مردووە.

تۆ باخی «ئۆزبەکیە»ی قاهیرەت لەیاد ماوە ؟

## نامەی سێیەم

شەو، درەنگانێ لە قاهیرە هەڵفڕین
دوور، زۆر دوور، لە نووکی باڵەکانیا، چرای سووری دابڕان هەڵکرابوو.
ئەستێرەکانم گرتنە نێولەپم و خەوتم.
لە ڕۆشنای کازیوەدا، لە فڕگەی «خەرتوم» نیشتینەوە،
ڕۆشناییەکی سپی بێ هەور،
ڕۆشنای چینی،
فنجانێکی چینی، ناسک وەک پێست.
«کۆمێت»ێکی دێوئاسا لە فڕگە بوو
فڕۆکەی هێڵی هەوایی سودان.
فڕۆکەیەکی وەرزشیی گچکەی زەرد و سووریش.
تێنەگەیشتم بۆچی لەوێ بوو.
فڕگەی «خەرتوم» خاوێنە.
خۆر لە فێنکی بەیانیدا بەرزدەبووەوە.
پالتۆکەم خستە سەرشان و ڕووبەڕووی دانیشتم.
لە هەرکوێ بم، تەنانەت لە زیندانیش،
ڕۆژەکانم بە زرینگانەوەی هەواڵێکی خۆش لە گوێما دەستپێدەکەن.
سودانییەکان جوانن
- ژنە هۆنەرێکی سودانی دەناسم، جوانی جوانانە - *
لە ڕەسەنترین داری «ئەبنۆس» داتاشراون.
لە کراسە سپییەکانیانا، کەتانی سپی و سپیەتی مێژەرەکانیانا.
ئەفسەرانی یۆنانی پیاسەدەکەن و بە ئینگلیزی دەدوێن
ڕاوچیانی موو زێڕینیش ویسکی دەخۆنەوە.
ڕاوچیان بۆ ڕاوی شێر هاتوون
ڕاوی پەمووش.
تفەنگەکانیان بەرگی نایلۆنییان هەیە.
خۆر بە ئەندازەی ڕمێ بەرزبووەتەوە،

باڵتۆکەم خستەلاوە و چاکەتەکەمم داکەند.
«کۆمێت»ەکە وەك هەڵچوونی بورکانێ لە زەمین بەرزبووەوە و
بەرەو لەندەن هەڵفڕی.

کیژۆڵەکەم تۆ لە کوێ بزانی،
کە «ئوسمانی»یەکانی وڵاتی من، لەم خاکە سوورەوە کۆیلەیان دەبرد.
کۆیلەی بەژن دوو مەتری،
هەروا عاج و ئاڵتونیش،
بە بشیلە خستنە دەربێی ژنان، باج و خەراجیان کۆدەکردەوە.
لەوانەیە هێشتا ئەم شێوازە لە ئاناتۆڵی باوبێ
بەڵام کۆیلانی ئەناتۆڵی کورتەڵە و ئێسك ئەستوورن.

* لە وەرگێڕانە فارسییەکەدا ئەم دێڕە هاتووە، بەڵام لە دەقە تورکییەکەدا ئەم دوو <> کەوانە بەواتای کورتکردنەوە و واژەی soylusuna هاتوون، کە لە وەرگێڕانە فارسییەکەدا نیین.

# نامەی چوارەم

لەوانەیە باڵدارەکان لە ئیستەنبول و «مۆسکۆ»وە بۆ دارولسلام بێن
باڵدارەکان بەگشتی لابەلا دەڕۆن
بەڵام فڕۆکەکەی من یەکەمین فڕۆکەیە، کە لە «مۆسکۆ»وە هاتووە،
یەکەمین «ئیستەنبول»یش بووم،
بۆنی ئەفریکام هەڵمژی
بۆنی ئەفریکای گەورەی ڕەش:
بۆنی بیابانی گەورە، گیانلەبەرانی گەورە، خۆری گەورە، بارانی دروشت و
ئەستێرەی دروشت دەدات.
بەنێوان دارخورما و درەختی مۆزدا هاتینە شار.
چووینە «ئاکواریوم»ێك تا چاو بڕکا سەوزە و
تا چاو کارکا گەرم.
دارولسلام لە خۆراوای دەریالووشی «هیندی»دایە
پێش ئیسلام، چەتەی دەریایی و بازرگانانی عەرەب
بە ئەبرۆی ڕەشەوە لەم کەنارە دابەزین
پاش ئەوانیش، چەتەی دەریایی دیکە و بازرگانانی دیکە
ئەوان ئەبرۆیان بۆر بوو.
بەڵام ئەبرۆ گرنگ نییە.
«دارالسلام» نێوەندی «تانگانیکا»یە.
تانگانیکا،
تانگانیکا، تانگانیکا
گۆرانییەك دەتوانێ بەم جۆرە دەستپێبکا،
ئاوازی تامتام،
تانگانیکا، تانگانیکا،
خەمبارانی، شادانی، ژیرانی، دێوانانی،
کەسکانی، سوورانی، زەردانی، سپیانی، ڕەشانی[1]،

تانگانیکا، تانگانیکا ...

دەزانی،

تانگانیکا لە باشووری خۆرهەڵاتیی ئەفریکایە،

نزیکەی دە ملیۆن مرۆڤ، زیاد لە سەد و بیست هۆز

موسوڵمان، کریست، بتپەرست.

دەزانی،

گرنگترین بەرهەمی: قاوە، گا و گیای «سیزاڵ»ە

گەڵاکانی سیزاڵ چەقۆی سەوز و ڕووتن

ڕێس و گوریس و «گونیە»یان لێ دەچنن،

دەزانی،

دەزانی پێش گەشتەکەم،

هیچ شتێك لەمانەم نەدەزانی،

دەزانی،

گەشتێك کە لەتەك تۆدا لەسەر نەخشە کردمان

لەیادتە کەشتییەکەمان سێ چارۆکەیی بوو، بنمیچی کەمانی

نیگاری زێڕینە-کیژی پێشەوەی لە تۆ دەچوو،

لەسەر ئاڵاکەی هۆنراوەم بۆ تۆ نووسی

لە دەریادا ماسی «چاوزمرود»مان گرت

باڵداری باڵ زێڕین لەسەر بورجەکەی نیشتنەوە.

لە کەنارەوە، مەیمون مۆزبارانیانکردین

چارۆکەمان هەڵدا و بە دەریا گەرماکانا تێپەڕین

سوڕاینەوە و لە تۆڕی نیوەڕوانان خۆمان ڕزگارکرد

تا گەیشتینە دارولسەلام.

گەشتێك کە لەسەر نەخشە لەتەك تۆدا کردمان لە یادتە

لە دارولسەلام لەتەك «سەربازێکی گومناوی» تانگانیکایی دوام.

لە برۆنز داڕێژراوبوو و لەسەر لاقە ڕووتەڵە و باریکەلەکانی،

چەك بەدەست، لە باری هێرشبردندا بوو.

لە پشت سەری، شەقام و لەنگەرگە و بەردەمی جامخانە،
لای ڕاستی تەلاری بانکێك و لای چەپی کلیسایەك،
پرسیم : " بۆ سەر کێ هێرشدەکەی ؟ "
گوتی : " لەشکری ئاڵمانیا "
هەروا گوتی "تا دەستپێکی جەنگی یەکەمی جیهانی هی ئاڵمانیا بووین.
" ئینگلتەرە هات و فەرماندەیی گرتەدەست، هێرشمانکردە سەر ئاڵمانیا،
ئاڵمانیا چوو و ئینگلتەرە هات،
ئینگلتەرە لە هەژدەوە تا شەست و دوو لێرە ما
ساڵی شەست و دوو «بریتانیا»مان وەدەرنا"
هەروا گوتی " کۆمارێکی ئازادین."
گوتی و بێدەنگ بوو
دارولسەلام شارۆچکەیەکی جوانە.
شەقامە سەرەکییەکانی خاوێن و ڕێکن
گەڕەکێکی گەورەی هیندی هەیە.
هیندەکان بە بازرگانییەوە خەریکن
ئەگەر بتوانن تەنانەت ئاوی دەریاش دەکەنە شووشە و دەیفرۆشن.
«تانگانیکا»یش دوژمنی بازرگانانی هیندییە،
لە شاردا یانەیەکی بریتانی هەیە،
پێشتر تەنیا سپیپێستەکان دەچوونە ئەوێ،
هەنووکە هەم ناوەکەی گۆڕاوە و هەم ئەندامانی
کۆشکی سەرۆککۆماری،
جاران بنکەی فەرمانداری بریتانی بوو،
کۆلێژێك، چل و هەشت هەزار خوێندنکار، گشتیان «تانگانیکا»یین و
مامۆستاکان بریتانی
کلیساکان، مزگەوتەکان، کۆشکەکان، هوتێلەکان و نوێنەرەکان[٢].
نوێنەرگەی[٣] سۆڤیەت لە باڵاخانەیەکدایە، کە لە موسوڵمانان بەکرێگیراوە و
لەسەر دەرگەکەی بە ڕێنووسی عەرەبی "بسم الله" نووسراوە،

ترام و ئۆتوبوس و هی دیکە دیارنین،
بەڵام ئۆتومەبێل لە گشت مارکەکان،
سوکانی هەموویان لەلای ڕاستەوەیە
بە شێوەی بریتانی.
شۆفێرانی تانگانیکایی زۆر شارەزان
شار «کابارێت»ێکی هەیە، کە تا بەیانی کراوەیە.
تانگانیکاییەکان، ئەوانەیان کە گەلیی و ساکارن، لەسەر خاک دەخەون و
ڕادەبن
لە کەپری حەسیرچنا،
زمانی فەرمی ئینگلیزی و «سوهیلی»یە
لە سەرتاسەری تانگانیکا، تەنیا یەک ئەندازیاری تانگانیکایی هەیە و
سێ پزیشک
من سەرخۆشی «تانگانیکایی»م نەدیوە
گشت سەرخۆشەکان سپیپێستن.
سپیپێستی بێکارم نەدیوە
گشت بێکارەکان تانگانیکایین
ئەوانەش کە لە سەرەڕێگەکان، شێری لە دار تاشراو بە گەشتیاران دەفرۆشن،
تانگانیکایین
ئەفسەری «تانکانیکایی»م دیت، سەرۆککۆماری تانگانیکایی و مامۆستای تانگانیکایی
«نایەرەرە»ی سەرۆککۆمار بە چاوانی ڕاماوی مامۆستایەک.
لە گشت دیوارەکانەوە تەماشا دەکا،
لەنێو چێوەکەیدا، لەپشت شوشەوە دانیشتووە و خۆی بەسەر گۆچانە دەسک سپییەکەیدا
داداوە.
«پۆلیس»م دیتن، کە تانگانیکایی بوون.
لە بانکەکاندا فەرمانبەری «تانگانیکایی»م نەدی
یا سپیپێست بوون یا هیندی.
مەیفرۆشەکان و کۆڵبەرەکان تانگانیکایی بوون.

گوندییەکان و شوانەکان، کرێکاران و هەروا سەرۆکی خێڵەکانیش :
لێرە زۆرێك کلیتە لەسەردەکەن، بە ڕەنگ و ئەندازەی جۆراوجۆرەوە
بە گوڵەنگ و بێ گوڵەنگەوە،
ئێمە تورکەکان کلیتەمان لە یۆنانییەکانەوە وەرگرتووە و لەسەری «عەرەبان»مان ناوە.
لەوانەشە لەسەری «سودان»یانیش،
ئەوانیش ناویانەتە سەر ئەفریکایانی ڕەش
یا ئەوان، یا ئینگلیزەکان، ئەگەر ئینگلیزییەکان لەسەریان نابن
سەرمسووڕنامێنێت، ئەگەر ئەسپی دەریایی کلیتە لەسەریش ببینم.

[١] لە دەقە تورکی و وەرگێڕانە فارسییەکەیدا تاك بەکاربراوە، بەڵام لەبەرئەوەی لە کوردییەکەدا لە ئاوەڵناو جیابێتەوە و خوێنەر تووشی سەرگەردانی نەبێت، ناچاربووم [کۆ] بەکاربەرم، واتە خەمباری/ خەمبارانی، شادی/ شادانی، ژیری/ ژیرانی، دێوانەی/دێوانانی تانگانیکا ،
کەسکی/کەسکانی، سووری/سوورانی، زەردی/زەردانی، سپی/سپییانی، ڕەشی/ ڕەشانی تانگانیکا،
[٢] نوێنەر : سفیر
[٣] نوێنەرگە : سفارت

# نامەی پێنجەم

لە دارالسلام، لە خانەباخی «ئوردووگەی ڕزگاری»،

لەناو گەرما خەوتن نییە.

گەرما بە پێستمەوە دەلکێ

ژن و مێردێکی کەنەدایی چەند ساتێك لەمەوبەر نزای شەوانەیان

بە تۆماری دەنگیی خوێند

شێرەکان نانەڕێنن

شێرەکان لەنێو جەنگەڵدان،

شێرەکان، فیلەکان، کەرگەدنەکان،

زێبراکان [1]، زەڕافەکان، گشت جۆرە مامزەکان

پێموایە لێرە پڵنگ نییە.

لە «باخچەی ئاژەڵ»ی مۆسکۆ پڵنگ هەیە، ورچی سپی و «پێنگوین»یش

«بەستەنی قەیماخی»یش هەیە.

لە مۆسکۆ هەنووکە بەفر دەبارێ، دانار دانار

گەرما بە پێستەمەوە دەلکێ

لەژێر پەردەکولە بە ڕووتی خەوتووم،

لەسەر پەردەکولەکە مارمێلکان

مارمێلکەکان لە تیمساحی گچکە دەچن، زمانیان دەردەکەن،

لەوانەشە ئەمانە مارمێلك نەبن

لە زیندانی «بورسا» لە چەرچەفەکان پەردەکولەمان چێدەکرد.

بەیانیان بە سەتڵ قۆلانچەمان دەڕشتە دەرێ.

گەرما بە پێستمەوە دەلکێ

گەرما لە ترپەی دڵما لێدەدا،

ئامێتەی خوێنم دەبێ و بە موولوولەکانما گوزەردەکا.

بەدڵنیاییەوە لە مۆسکۆ بەفردەبارێ،

لەوانەشە باران ؛

بەرلەوەی بنووی، لە پەنجەرەوە تەماشای گەرمیپێوت کرد؛
ئایا پازدە پلە ژێر سفر بوو یا حەقدە پلە ؟
لە پشتسەری چەرپاکەتەوە، چراخەوێکی شین!
بیر لە چی دەکەیتەوە ؟
نەشێ ئەم جارەش تا سەرت لەسەر سەرین نابێ، خەوت لێ کەوتبێ ؟
لە دارولسلام لە کەپرۆکەی «ئوردووگەی پزگاری»
لەتاو گەرما خەوتن نییە.

[١] Zebra. جۆرە گوێدرێژێکە، کە لە زمانی کوردیدا بە گوێدرێژی کێوی / جەنگەڵی [کەری وەحشی] ناسراوە.

## نامەی شەشەم

ئەم بەیانییە تەماشای دەریالوشی «هیندی»م کرد.
لە بارەی دەریالوشەکانەوە دوو وشە قسەم هەیە :
دەریالوشێک کە لە کەنارەوە تەماشایکەی
لەتەک دەریای مەڕمەڕە جیاوازی نییە،
دەمەوێ بڵێم :
«تولیاکۆفا»، دەریالوشەکان وەک ئەوینی گەورە وان.
لەتوانادا نییە تەماشاکردنیان
دەبێ بژیت لەتەک دەریالوشان.

## نامەی حەوتەم

لە بازاڕان گەڕام، ئازیزم،

نرخەکانم نووسیون

ئانگانیکا زۆر هەرزانییە

بۆ نموونە خۆرەتاو.

گەیبوترین و سەرسەختترینی،

بۆ نموونە باران،

بارانێك کە چەند مانگ بێ بڕانەوە دێتەخوار،

تای درێژماوە و جۆراوجۆر

یا دەستە بۆر و ڕەشەکان

دەستە لاو و دەستە پیرەکان

نینۆك و نێولەپی هەموویان خەناوی

تەنانەت مۆز،

هێشووی پێنج کیلۆیی

لە شووشەیەك پێپسی کۆلا هەرزانترە،

ئەمانەم بۆ تۆ نووسین، ڕۆشنای چاوم، بیردەکەمەوە،

ئایا «ئاناتۆڵی» من لە ئانگانیکا گرانترە ؟

لە هەندێ شوێنیا باران گرانترە.

لە هەندێ وەرزیا خۆرەتاو.

بەڵام نرخی تاکان،

یا دەستەکان

بەتایبەت ئەو دەستانەی کە پەنجەیان خوێنینە

هەرگیز لەوانەی ئێرە گرانتر نینە،

بەڵام مۆز،

لە وڵاتی ئێمە نایێتەبەر

بەپێچەوانەوە پیاز و خوێ،

نەك پێنج کیلۆ، بەڵکو هەر کیلۆیەکی بە نرخی مۆزی ئێرەیە.

## نامەی هەشتەم

چۆنی «تولیاکۆڤا» لە چ دونیایەکدای ؟

بڕچ کاپەنگی، چۆنی ؟

لەچیدای، ئەی برژانگ شین ؟

برژانگە شینەکانت، ڕێمبدەن،

دەمەوێ نێوی چاوانت ببینم

دەمەوێ لەنێو چاوانتا بگەڕێم و لەتەك خۆم ڕووبەڕووبم.

لەوانەیە لەنێو دیڕی بەرتووکێکا

لەوانەیە جارێکی دیکە لە «بێشانیا»، وێستگەی ئۆتوبوس

لە چاوانتانا لەتەك خۆم ڕووبەڕووبم،

بڵێم " سڵاو نازم، چۆنی، بەختەوەری ؟ "

سڵاو لە ڕوباری مۆسکۆ،

سڵاو لە مەیدانی سور، دوکەڵکێشی کارخانەکان، گشت شانۆکان

سڵاو لە دەرگەی ماڵەکەمان،

سڵاو لە بۆ وێنەکەی هەڵواسراوەکەی ئیستانبوڵ،

گەر لە هەواڵی من بپرسی، من دوو ڕۆژە لێرەم لە باشوور،

لە «ئاروشا » لە « موشی».

لە دەوروبەری کێوی بەفرگرتووی «کلیمانجۆرا » .

کێوێکی گەشتیاریی

ئاسوودەی هوتێلەکان، بۆ توریستە سویسرییەکانە.

لە «موشی» خێڵی « جاگا » دەژی .

لە هوتێلەکان، قاوەخانە و بێشەکانی «سێزاڵ»دا کاردەکەن.

بێشەکانی سێزاڵ، هی ئینگلیس و هیندی و یۆنانییەکانن

خەڵکی «جاگا » ڕووخۆش و ژیر و ئارامن.

پیاوانیان بە کراس و شەڵواری کورتەوە، زۆربەیان پێخاوس

حەزیان لە بایسکیل هاتووتنە،

ژنانیان لەنێو کراسە سوورەکان، بە لەنجەولار دەڕۆن و

له بان سەریان باری گەورەتر لە خۆیان هەڵگرتووە
گشت ژنانی ئەفریکا ئاوهان.
کیژۆڵانی جوانم دیتن.
بێبەری ڕەش، نوقلی بادامی،
کراسە نایلۆنەکانیشیان فشن
خوێندەوارانیان لە ئەناتۆڵی زیاترن
چوومە بورکانی « نگۆرۆ نگۆرۆ »
دەمی بورکانەکە بە گیا و درەختان داپۆشراوە.
گوتیان پانتایی دوو کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.
کەرگەدەنی گەشتیارییم دیت.
زەرافە و فیلی گەشتیاریی
بە گەل ڕێدەکەون،
جیپەکان بە کنیانا دەڕۆن، بەلای لوتیانا.
سەرێ بەرزدەکەنەوە و سەرنجێ دەدەن،
مارکەی ئۆتۆمۆبێلەکە دەناسنەوە:
لاندرۆڤەر.
بەخەمبارییەوە بەردەکەنە دواوە،
بە بێزاری.
تەنیا مامزەکان لەتەک « لاندرۆڤەر» ڕانەهاتوون.
سڵەمینەوە و هەڵهاتن.
هەروا ئەوەی شەوێک، گەشتیارێکی ئەمەریکایی لەبەر فرە مەستی لە بێشەوارێکا
خەوی لێکەوتوو،
شێرەکان تاکو بەیانی لە بان سەری چاوەڕێمانەوە
دیتیان کە لە خەو ڕانابێ،
کەوتنە خواردنی
گۆڕەکەم دیت، ڕووداوەکە لەسەر کێلی گۆڕەکەی نووسرابوو
لەم دەوروبەرەدا « ماسایی»یەکان دەژین، ڕووت و قووت

تەنیا نێولنگانیان پۆشراوە.

گەورە پەیکەرن.
شەیدای ڕەنگی قاوەیین
ڕوخساریان بە قاوەیی ڕەنگدەکەن
لێواری گوێچکەی ژنانیان، تا سەر شانیان شۆڕبووەتەوە.
دەڵێن بە کێشێك درێژیانکردووە.
« ماسایی»یەکان کۆچەرن.
گەلەدارن
گۆشتی مانگاکانیان دەخۆن و خوێن و شیریان بە گەرمی دەخۆنەوە.
کاتێك شێری هێرش دەکاتە سەر گەلەیەك، دەیگرن
بە کوتەك لە سەری دەدەن.
لە هوتێل کاخەزێکیان پێدایین،
لە بورکانەکە چ شتێ فرەتر بەلاتانەوە پەسەندبوو ؟
فیلەکان ؟
کەرگەدنەکان ؟
ماساییەکان ؟
یا کارمامزەکان ؟

## نامەی نۆهەم

ڕۆژانێکم بیردەکەونەوە کە لە زیندان ئازادبووم
ئازادیاننەکردم. ئازادبووم،
ڕۆژانێ کە لە نێوەوە بە فشاری خۆم و لە دەرەوە بە فشاری دۆستان و
پێگەیان، لە زیندان ئازادبووم.

شادی
هاوسەری، جەژن،
شادی،
کەمێ لەخۆباییبووم،
کەمێ شێواو.

شادی،
لەسەر چڵەکانی، درەوشانەوەی خەون و هیواکان،
میوە نا، درەوشانەوە.
دوان لەمەڕ زیندان بۆ هەر کەس و بۆ خۆت.
هێشتاکە زیندان دێتە خەونت،
لە خەو ڕادەپەڕی
خوو و یاساخییەکانی سالانی زیندان یەخەت بەرنادەن.
سەری پاکەتی نامەکانت داناخەی،
چاوەڕێی ساتەکانی چامولەی خواردنیت،
کاتێ شەو تاریک دادێ، چاوەڕێی دەرگە لە دەرەوە داخرێ و
گلۆپەکان خۆبەخۆ پێبکرێن،

شادی
هاوسەری، جەژن،
بەلام ڕۆژانی جەژنیش وەك ڕۆژانی دیکە کۆتاییان هەیە
دەبینی سەربانی خانووەکەت دلۆپەدەکا،
دەرگە و پەنجەرەکانی چێکردنەوەیان گەرەکە،

دەبێ داوای ئاو و گاز و کارەبابەستن بکەی،
دەبێ چەرچەف و قاپ و جامۆڵە و پەرتووک بکڕی.
بازووەکانت ئامادەی کارن،
لە زیندانیش هەر کاریاندەکرد،
بەڵام مێشکت هێواش بووە،
پارەشت نییە،
قەرزاربوونیش ترسناکە.
بنەوانی ماڵی ئازادیت لە کوێوە و چۆن دەستپێبکەی ؛
واتە دەمەوێ بڵێم :
باری تانگانیکا لە باری کەسێك دەچێ، کە لە زیندان ئازادبووبێ.

## نامەی دەهەم

گوێچکەم بە زەمینەوە نا،
گوێم لە خاکی ئەفریکا ڕادێرا،
دەنگەلێك لە «ئۆگاندا» و «مۆزامبیك»ەوە دێن،
لە ئەفریکای باشووری، بێ خەنینەکان،
بە تووڕەییەوە زنجیرەکانیان بە زڕە دەهێنن.
جەنگەڵەکانی «ئەنگۆلا»، وەك شێرە سەوزەکان، لە خوێنگەوزاو دەناڵێنن.
ئیمپریالیزم، دوا جەنگەکانی دەکات،
بەڵام چەك و زیندانی و فەرمانداری هەیە.
سەرم بەرزکردەوە و تەماشامکرد:
ئەفریکا لەسەر دووڕیانێك وەستاوە،
ڕێگەیەك هەیە، جارێکی دیکە لە بێچ و پەناوە بەرەو دەستبەسەریی دەچێتەوە،
ڕێگەیەکی دیکەش بەرەو ئازادی و برایی فراوان.
واتە دەمەوێ بڵێم،
هاوسەری هۆشمەند و جوانی من
جارێکی دیکە نامەی نۆهەم بخوێنەرەوە.
ژیران ئەلفێکیان بەسە.
نازانی چەندە ئارەزووی دیدارت دەکەم مۆسکۆییەکەی من
«تولیاکۆڤا»ی من

فێبریوەری ١٩٦٣

****************************************

* ڕاپۆرتی تانگانیکا یەکێکە لە دواهەمین هۆنراوەکانی «نازم حیکمەت»، چونکە لە فێبریوەری ١٩٦٣ هۆنراوەتەوە و «نازم حیکمەت» لە جونی هەمانساڵدا مردووە. ئەم ڕاپۆرتە لە شێوەی دە هەڵبەست-نامەدا، ئاراستەی «ڤێرا تولیاکۆڤا» هاوسەرە ڕوسەکەی کردووە، کە لە ساڵی ١٩٦٠دا لەتەك هۆنەر هاوسەریی کردووە.
** «تانگانیکا»، وەك دەزانن لە کاتی گەشتەکەی «نازم حیکمەت»دا، دوو ساڵ بوو، کە سەربەخۆیی بەدەستهێنابوو و بە پێشەوایی «جولیوس نایەرەرە Julius Nyerere» کەوتبووە نێو وڵاتانی هاوبەرژەوەندی ئینگلیسی .. بە ڕێکەوتنی «زنگبار» لە ساڵی ١٩٦٢دا ئەو وڵاتە «کۆماری تانزانیا»ی پێکهێنا و «جولیوس نایرە» وەك سەرۆککۆماری دانرا.

# بەخاکسپاردنی من

ئایا بەخاکسپاردنم لە هەوشەی ماڵەکەمانەوە دەستپێدەکات ؟
چۆن لە نهۆمی سێیەمەوە دەمهێننە خوارەوە ؟
تابوتەکە لە ئەسانسوردا جێینابێتەوە،
پێپلیکانەکانیش تەنگلان.
لەوانەیە لە هەوشەدا کەمێ خۆر بەربووبێتەوە و کۆتران بفڕن.
لەوانەیەبەفر بباریٚ، لەتەك ها و هوی منداڵان
لەوانەشە باران بێ و قیرتاو تەڕ
لە هەوشەشدا سەبەتەی زبڵ هەبێ، وەك هەمیشە
ئەگەر بەگوێرەی نەریتی نێوخۆیی، من بە ڕومەتی دیارەوە بخەنە ئۆتومەبێلەکەوە
لەوانەیە شتێك لە کۆترێکەوە بچکێتە سەر نێوچەوانم: خۆشبەختییە.
چ تیپی موزیك بێت و چ نەیێت، منداڵان دێنە لای من.
مردووان بۆ منداڵان سەرنجراکیشن.
پەنجەرەی ئاشپەزییەکەمان، لە دواوە بۆم دەڕوانێ
بالکۆنەکەمان بە جلکە شۆراوەکانییەوە بەڕێمدەکا
من لەم هەوشەدا بەختەوەر ژیام، هێندە بەختەوەر کە ناتوانیت
وێنای بکەی
هاوسێیانم، بۆ هەمووتان هیوای تەمەندرێژیی دەخوازم ...

ئەپریلی ١٩٦٣

## بۆ « ڤێرا »

بە منی گوت : وەرە
بە منی گوت : بمێنەرەوە
بە منی گوت : پێبکەنە
بە منی گوت : بمرە
هاتم.
مامەوە.
پێکەنیم.
مردم.

**بەرهەمەکانی نازم حیکمەت و مێژووی بڵاوکردنەوە و دانانیان**

یەکەمین هۆنراوەی نازم حیکمەت بەناوی ( هاواری نیشتمان) لە یازدە ساڵیدا ساڵی ١٩١٣

کۆمەڵیك هۆنراوە و نیگارکێشی لە پەڕاوی فێرگەدا کە سامیە'ی خوشکی پاراستوونی [ ١٠ پەڕاو] ساڵی ١٩١٧

گۆرانی خۆرەتاونووشان ساڵی ١٩٢٨

٨٣٥ دێڕ ساڵی ١٩٢٩

ژو کوندو ( سی- یا- ئو ) ساڵی ١٩٢٩

یەك = ١+١ ساڵی ١٩٣٠

سێ لێدان ساڵی ١٩٣٠

شارێك کە دەنگی خۆی لەدەستدا ساڵی ١٩٣١

تێلەگرامێك کە لە (شەو)ەوە دەگات ساڵی ١٩٣٢

بۆچی بەنەرجی خۆکوژی کرد ساڵی ١٩٣٢

( ئێسکەپەیکەر و ماڵی مردووان) [ دوو شانۆیی] ساڵی ١٩٣٢

نامەگەلێ بۆ تارانتابابو ساڵی ١٩٣٥

خوێن نایێتەگۆ [ ڕۆمان، لەشێوەی پەراوێز] ساڵی ١٩٣٥

فاشیزم و نەژادپەرستی ساڵی ١٩٣٥

وێنەکان ساڵی ١٩٣٥

پیاوی لەبیرکراو [شانۆیی] ساڵی ١٩٣٥

دلاوەریی شێخ بەدرەدین کوڕی دادگەر [سیماونا] ساڵی ١٩٣٦

وەرگێڕانی بەرگی یەکەمی (جەنگ و ئاشتی) تۆلستۆی [لە زیندان] ساڵی ١٩٤٢

کارکردن لەسەر سێ کۆمەڵە هۆنراوە بەناوی ( چوارینە)، (دیمەنی مرۆیی سەرزەمینی من) و ( هۆنراوەگەلی هۆنراوە لە نێوان سات ٩ و١٠ی شەودا) [ لە زیندان ] ساڵی ٤٣-١٩٤٥

نووسینی ( هۆنراوەگەلێك لە بارەی ژیانەوە) ١، ٢ و ٣ [ لە زیندان] ساڵی ١٩٤٧

نووسینی شانۆیی ( فەرهاد و شیرین) و جوانی [ لە زیندان] ساڵی ١٩٤٨

نووسینی شانۆیی ( یوسف و زولێخا) [ لە زیندان]

چاپکردنی هۆنراوەکانی نازم حیکمەت بە زمانی فەرەنسی لە پاریس ساڵی ١٩٥١

وتارگەلی جۆراوجۆری نازم حیکمەت لە چاپکراوەکانی سۆڤیەتدا

| | |
|---|---|
| لەبارەی دەستێوەردانی ئەمریکا لە تورکیە و ( میللەی تورك) | ساڵی ١٩٥١ |
| وتارگەلی جۆراوجۆر لە چاپکراوەکانی سۆڤیەتدا، پەردەهەڵماڵێن | |
| لە ڕووی ڕژێمی موندەریس | ساڵی ١٩٥٣ |
| گەمژە [ شانۆیی ] | ساڵی ١٩٥٥ |
| هۆنراوە ( لەنێوان عارەقە و خوێندا) | ساڵی ١٩٥٥ |
| شانۆیی ( ئایا ئیڤان ئیڤانۆڤیچ هەبووە) [ئەم شانۆییە لە مۆسکۆ، | |
| پراگ و بێرلین'ی خۆرهەڵاتی هاتە سەرشانۆ و بۆ سەر زمانی فەرەنسیش | |
| وەرگێڕدراوە و ساڵی ١٩٥٨ لە گۆڤاری ( زمانە نوێیەکان )دا چاپکرا | ساڵی ١٩٥٦ |
| دوورخراوگە بێشەیەکی دژوارە [ لە فەرەنسە] | ساڵی ١٩٥٧ |
| چاپی دوو شانۆیی بەناوی (مانگا) و ( وێستگە) لە بولگاریا | ساڵی ١٩٥٨ |
| شانۆیی ( تارتوف)، ( شمشێری دیموکلیس) و ( ئەفسانەی ئەڤین) | ساڵی ١٩٦٠ |
| پاریس ، گوڵی سوری من | ساڵی ١٩٦١ |
| هۆنراوەی درێژ ( ڕاپۆرتی هاڤانا) و ( ئاوتۆبیۆگرافی) | ساڵی ١٩٦١ |
| هۆنراوەی درێژ [ ڕاپۆرتی تانگانیکا] | ساڵی ١٩٦٣ |
| برا، ژیان جوانە [ ڕۆمان] | ساڵی ١٩٦٣ |
| کۆمەڵە بەرهەمێکی نازم حیکمەت [ لە ٨ بەرگدا بە زمانی بنەڕەتی] | |
| لە (سۆفیا)ی پایتەختی بولگاریا | ساڵی ٦٧ - ١٩٧٢ |

**سەرچاوەی وەرگێڕان:**

**پەرتووکی ( آخرین شعرها ترجمهٔ: رضا سید حسینی - جلال خسروشاهی انتشارات بامداد آذرماه ١٣٥٩)**

# Nazim Hikmat
# Last lyrics



**translated by: Hejên**

**First Edition, August 2014**

